زنجیرەی ( ١٠٠ ) کتێبی کوردی
ژمارە ( ١٨ )

# جەنگی دەروونی

نووسینی :
ابوبکر عەلـــی

چاپی یەکەم

١٤١٨ ک ١٩٩٧ز

بسم الله الرحمن الرحيم


❁ ناوی کتێب : جەنگی دەروونی

❁ نووسینی : ابوبكر علی

❁ چاپی یەکەم ١٤١٨ك - ١٩٩٧ز

❁ ژمارەی سپاردن (-267- ) ١٩٩٧

❁ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

# پێشەکی

ئەمڕۆ لەوە دەچێت لە کەس شاراوە نەبێت کە جەنگی دەروونی چەندە کاریگەرەو بەهۆی پێشکەوتنە خێراو سەرسوڕهێنەرەکانی هۆیەکانی کەناڵ و دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە، شەوو ڕۆژو بێ پسانەوە بەجۆرەها شێوە لەکاردایەو دەیەوێت ئامانجەکانی بەدی بێنێت. ئەمڕۆ گەر هوشیاریەکی باش لە ئارادا نەبێت دوژمن لە ڕێی جەنگی دەروونییەوە وا لە نەوەکان دەکات بە شەرمەوە سەیری مێژووی خۆیان بکەن و ئێستاو ئایندەشیان لە خۆبەدەستەوەدان بە ناوەندە بڕیاربەدەستەکان ببیننەوە!

جەنگی دەروونی ئەو چەکە ژەهراوی و کوشندەیە کە ئاراستەی عەقل و دەرونی مرۆڤەکان دەکرێت هەوڵ دەدات ویستی مرۆڤ تێک بشکێنێ، لە ڕێبازو کارو خەبات و ئایندەی خۆیو گەل و بزاڤەکەی نائومێدی بکات و بە پاشکۆیەتی ڕازی بێت و گومان لە ڕاستیو ڕەوایی کێشەکانی بکات.

ڕۆژانە دەبینێت چۆن مێرووله دەکرێت بە فیل و بەپێچەوانەشەوە، چۆن هەقخوازان ناوو ناتۆرەی ناشیرینیان دەدرێتە پاڵ و چەندەها ڕەمزی ساختەش دەکرێن بە ڕزگارکەرو پاڵەوان و ئاشتی خوازو مرۆڤ دۆست! بەتایبەتی لە کوردستانداو لەم قۆناغە مێژووییە گرنگەدا ئەم جەنگە زۆربەی ڕەهەندەکانی ژیانی تاکی کوردی گرتۆتەوە. شەڕ لەگەڵ عەقل و ئیرادەو باوەڕو دەروون و ڕەوشتی کوردا دەکرێت.

زۆرجار بەداخەوە کورد خۆشی بەشداری ئەو شەڕە نەگریسە دەکات. ئەمڕۆ هەموو شێوازەکانی جەنگی دەروونی لە چاوڕاوو پڕوپاگەندەو فشاری سیاسیو ئابوریو کوشتاریش لەدژی گەلەکەمان بەکاردەهێنرێت. بزاڤی ئیسلامیی کوردستانیش، وەک باڵێکی بزاڤی ئازادیخوازی گەلی کورد سەرەڕای ئەو جەنگەی بە سیفەتی کورد بوون وەک هەر شەپۆل و تەوژمێکی ترو سەراپای کۆمەڵگا لەگەڵی دەکرێت، خۆشی بە حوکمی ئیسلامیی بوون دەکەوێتە بەر فشارێکی زیاترو بوون بە ئامانجی شێوازێکی تایبەت لە جەنگی دەروونی. جا بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بە گشتیو تێکۆشەرانی بزاڤی ئیسلامیی کوردستان لە هەموو کات زیاتر چاوکراوە بن و بتوانن بەرەو ڕووی ئەم جۆرە جەنگ و ململانێیە ببنەوە، پێویستە

شێوازو ئامرازەکانی جەنگی دەروونی بناسن و بزانن بەکام شێوە هەوڵی چۆک پێدادانیان دەدرێت؟

منیش هەر بۆ ئەم مەبەستەو وەک بەشداریکردنێکی (متواضع)انە لەو بەرەو رووبوونەوەدا بە باشم زانی پوختەیەک دەربارەی جەنگی دەروونیو شێوازو ئامرازو جۆرو خاسیەت و ئامانج و شێوەی بەرهەڵستیکردنی بنوسم و بیخەمە بەر دیدەی خوێنەران.ا هەوڵم داوە بە کورتی خوێنەری ئاسایی ئاگایی بەسەر ئەم شێوازە لە جەنگ پەیدا بکات و بزانێت دوژمن دەیەوێت لە دوایەوە کام ئامانجانە بەدی بێنێت؟ وە رێگای گەیشتن بە ئامانجەکانی چییەو چۆنیش خۆی بپارێزێت. ئەوەندەی پێشم کرابێت ویستوومە دیدگای ئیسلامیی تێکەڵ بە باس و خواسەکان بکەم. ئەویش لەبەرئەوەی گەلی کوردستان زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانە، بە حوکمی ئەوەش هەروەک چۆن بەسیفەتی کوردبوونی جەنگی دەروونی لەگەڵدا دەکرێت، بەسیفەتی موسڵمان بوونیشی دیسانەوە هەر بەهەمان شێوەیە. بۆیە جێگای خۆیەتی لە هەموو نەخشەیەکی رووبەڕووبوونەوەو بنیاتناندا وزە شاراوە ئیسلامییەکەی مرۆڤی کورد لەپاڵ هەستە نیشتمانیو نەتەوەییەکەیدا سوودی تەواوی لێوەربگیرێت. چونکە ئەگەر ئەو وزەیە بەجوانیو لە شوێنی خۆیدا بەکاربێت، هۆکارێکی زۆر کاریگەری خۆبەدەستەوەنەدان و بەرگری کردن و چۆک دانەدان و متمانە بەخۆبوونەو نەکەوتنە ژێر کاریگەری جەنگی دەروونییە. بۆیە وەک باس کرا دەبێ ئەو رەهەندە کاریگەرەی تاکی کورد لەهیچ جەنگێکی بەرگریو بنیاتنان و ئاوەدانیدا لەبیرنەکرێت. حەزدەکەم ئەوەش بڵێم بە پلەی یەکەم ئەوەم لا گرنگ نییە کە ئاخۆ لە رووی تیۆرییەوە بابەتەکە تا چەند پێوەرە زانستییە ئەکادیمییەکانی بەسەردا دەچەسپێ، زۆر ئاساییە کە هەرچەندە نزیکەی (٢٠) سەرچاوەم بۆ ئەم نووسینە بەکارهێناوە لە رووی زانستییەوە بچێتە خانەی ئامادەکردنەوە. ئەوەی گرنگ بێ لام ئەوەیە لەم قۆناغە ناسکەدا توانیبێتم ئەوەندەی لەدەست من هاتبێ بەکردەوە سوودێ بگەیەنم هیوادارم پسپۆڕانی ئەم بوارە بتوانن لە رووی تیۆریشەوە لێکۆڵینەوەی زانستی بەپێز بنووسن و کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بکەن.

سلێمانی
١٥ / ٩ / ١٩٩٧

# چەمکی جەنگی دەروونی

جەنگی دەروونی تاکو ئێستا پێناسەیەکی تەواوی بۆ دانەنراوە، زیاتر پسپۆڕەکانی جەنگی دەروونی خەریکی بوون، نەک مەڵبەندەکانی توێژینەوەی زانستی. ئەم پسپۆڕانەش زیاتر بیریان لە هۆکارو ئامانجەکان دەکەنەوە وەک لە خودی زانستەکە. *لەڕاستیدا جەنگی دەروونی بریتییە لە شاڵاوکردن بۆ سەر ئەو پاڵنەرە ناوەکیانەی ڕەفتاری ئاشکرای مرۆڤ دیاری دەکەن. تاکو دوژمن بخاتە حاڵەتی شکستەوە.* لەبەرئەوە ئەو چوارچێوە فکریو تیۆریەی کە لەسەری دامەزراوە تاکو ئێستا نەچەسپاوە. ئەمەش لەبەر چەند هۆیەک[1].

**یەکەم** : جەنگی دەروونی لەمەوپێش ئامرازێ بووە لە ئامرازەکانی جەنگ و شانبەشانی ململانێی جەستەیی کاری کردووە. بەڵام ئەمڕۆ سەربەخۆیی خۆی پەیداکردووە. بۆتە (بدیل)ی جەنگی گەرم. دیاردەیەکی تایبەتە لە هەردوو حاڵەتی جەنگ و ئاشتیدا بەرپادەکرێت. بەجۆرێک بۆتە ئامرازێکی راپەڕاندنی سیاسەتی دەرەوە.

**دووەم** : ئەو پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەی کە ئامرازەکانی مامەڵەکردنی دەروونیو ڕێڕەوەکانی بەخۆیەوە بینیوە. نەک تەنها لەسەر ئاستی مامەڵەکردنی تاکدا بەڵکو لەسەر ئاستی داڕشتنەوەی کەسێتی نەتەوەیشدا.

**سێهەم**: زاراوەی جەنگی دەروونی لەگەڵ زۆر زاراوەی تری جۆراو جۆردا تێکەڵ بووە کە زۆرجار هاوواتان، یاخود چەند رواڵەتێکی تری مامەڵە کردنی دەروونین و لێیەوە نزیکن وەکو: جەنگی سارد، جەنگی زاگەیاندن، جەنگی چەمکەکان....هتد.

*کەواتە جەنگی دەروونی مامەڵەیەکی دەروونیە، بەمەبەستی تێکشاندنی متمانەی کەسێتی ئیسلامیو نەتەوەیی ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە :*

[1] د. حامد ربيع/ الحرب النفسية في الوطن العربي/ بغداد/ ١٩٨٩. لا٣٣٣.

(١) جەنگە، واتە هەموو ئامرازێ تیایدا شیاوە، بێگومان لە روانگەی تیۆریستە رۆژئاواییەکانەوە.
(٢) جەنگە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاراستەی دوژمن دەکرێت، دوو لایەنی هێرش کەرو بەرگریکەر لەئارادان. بەلام جەنگی دەروونی بەرگری ئاراستەی خودی گەل و بەرەی ناوخۆ دەکرێت، بۆ تێکشاندنی شالاوی پروپاگەندەی دوژمن و بەرزکردنەوەی وورەی رۆڵەکانی. هەروەها گەشەپێدان و تاودانی گیانی فیداکاری و نەبەزین و نەکەوتنە ژێر کاریگەری جەنگی دەروونییەوە.
(٣) رێسایەکی بەناوبانگ لە جەنگی گەرمدا هەیە کە دەڵێت: ( هێرش کردن باشترین هۆی بەرگری کردنە). ئەم رێسایە بەهەمان شێوە لەجەنگی دەروونیشدا راستە.
(٤) جەنگی دەروونی وەک هەر جەنگێکی تر پێویستی بە نەخشەی داڕێژراو هەیە، کە تیایدا سەرکردایەتیو ئامانج و دەورەکان و قۆناغەکانی جەنگەکە بەڕوونی دیاریکرابێت.

بەلام سەرەڕای ئەم دیرانەی پێشەوە ئێستا جەنگی دەروونی وردە وردە بەرەو ئەوە دەڕوات چەمک و زاراوەو بنەما تیۆرەکانی بەرەو جۆرێک لەچەسپاوی بڕوات.

بۆیە ئێستا ئەو پێناسەی جەنگی دەروونی کە جێگای رەزامەندی زۆر ناوەندە بریتییە لە: بەکارهێنانێکی نەخشە بۆکێشراوی پروپاگەندەو رێو شوێنی تری راگەیاندن لەلایەن دەوڵەتێک یان کۆمەڵە دەوڵەتێکەوە کە ئاراستەی کۆمەلانی، نەیار، یان دۆست، یاخود بێلایەن دەکرێت. بەمەبەستی کارکردنە سەر راو سۆزو رەوت و رەفتاریان. بەجۆرێ کە یارمەتی جێبەجێکردنی سیاسەتی ئەو دەوڵەتە یان ئەو کۆمەڵە دەوڵەتەی بەکاریان هێناوە بدات....[٢]

بەلام جێگای سەرنجە کە جەنگی دەروونی مەرج نییە تەنها لەنێوان دەوڵەتەکاندا بێو دەوڵەت پێی هەڵسێ بەڵکو دەکرێت پارتەکان و بزاڤە رزگاریخوازو شۆڕشەکان و رێکخراوە سیاسیو نەتەوایەتیە جۆراوجۆرەکان بەکاری بێنن و سوودی لێوەربگرن. هەروەک لە کوردستانی خۆماندا شایەتی ئەو حالەتەین.

[٢] الدعاية والاشاعة والحرب النفسية، ملزمة/ ئازاد قزاز ص١.

لەڕاستیدا پێناسەی تری واش هەیە کە چوارچێوەی جەنگی دەروونی فراوانتر دەکات کە جگە لە پڕوپاگەندەو کەرەسەکانی تری ڕاگەیاندن بابەتی تر دەخاتە چوارچێوەی ئەو جۆرە جەنگەوە لەوانەش پێناسەکەی دکتۆر عبدالقادر حاتم لە کتێبی (ئیسلام و پڕوپاگەندە)دا کە دەڵێت: ( *بریتییە لە بەکارهێنانی پڕوپاگەندە دژی دوژمن هەروەها کۆمەڵێ ئامرازی تری کەدەشێ مۆرکی جەنگ یا ئابوری یا سیاسی بەخۆوە بگرن و دەبنە تەواوکەری چالاکیە پڕوپاگەندەییەکە* )[1]

پسپۆڕە سەربازیەکان لەو بڕوایەدان بۆ دەستخستنی سەرکەوتنێکی خێرا، کاریگەری لەچەکی تر زۆرترە، پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمودەیەکیدا ئاماژە بەم حاڵە دەکات و دەفەرمویت: ( ونصرت بالرعب مسيرة شهر)

هەروەها دەفەرمویت: (جاهدوا المشركين بأمولكم وأنفسكم وألسنتكم). کە لە هەردوو فەرمودەکەدا ئاماژە بە ڕۆڵ و کاریگەری جەنگی دەروونی لەتێکشکاندنی نەیاران و دوژمندا کراوە.

چەندەها سەرکردەش باسیان لە ڕۆڵی جەنگی دەروونی لەبەڕێوەبردن و بردنەوەی ململانێکاندا کردووە. لەوانە سەرکردەی ئەڵمانی (دومیل) کە دەڵێت: (*سەرکردەی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە پێش ئەوەی دەست بەسەر جەستەی دوژمنەکەیدا بگرێت، دەست بەسەر عەقڵیاندا دەگرێت*)[2]. جەنەڕاڵ (دیگۆل)ی فەرەنسیش دەڵێت: (*بۆ ئەوەی دەوڵەتێک سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، دەبێت پێش ئەوەی هێزەکانی بخاتە گەڕ جەنگی دەروونی بەرپا بکات*).

(شەرشل)ی بەریتانیش پێی وایە زۆرجار جەنگی دەروونی سیمای مێژووی گۆڕیوە)[3].

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە شتێک بکەین کە ئەویش ئەوەیە هەندێ وڵات بۆ ئەوەی بەرامبەرەکانیان (حساسیە)تیان بەرامبەر پەیدانەکەن چەمکی جەنگی دەروونی بەکارناهێنن. بەڵکو زاراوەی تر بەکاردەهێنن وەک: پڕوپاگەندە کە ئەمریکیەکان بەکاری دەهێنن. هەروەها جەنگی سیاسی کە بەریتانیەکان بەکاری دەهێنن.

---

[1] مجلة التوحيد العدد ١٩٩٣/٦٧، ص١٦١.

[2] مذكرات روميل ص١٧٦ لە هەمان ژمارەی (التوحيد)ەوە.

[3] مذكرات ديغول ص١٢٤ سەرچاوەی پێشوو.

کەواتە ئەمڕۆ جەنگی دەروونی خزمەتێکی زۆر بە ستراتیژیەتی دەوڵەت و هێزەکان دەکات، کاریگەریەکی زۆری بەسەر کۆمەڵگاو گەلانی دنیاوە هەیە. هەر بۆیە دەبێ ئێمەش وەکو کورد و بزاڤە رزگاریخوازەکەی، هەروەها وەکو وڵات و رۆڵەکانی بزاڤی ئیسلامی کوردستانی کە دەمێکە لەپاڵ کاولکردنی وڵات و کوشت وبڕو قەتڵ و عامی خەڵکەکەماندا، ئامانجی شالاوێکی جەنگی دەروونی نەخشەبۆ کێشراوی گڵاوی دوژمنانیداین؛ هونەری ئەم جەنگەو شێوازی بەرگری کردنی لەخۆمان لەبەرامبەریەوە فێر ببین.

## کورتەیەکی مێژوویی

بەکارهێنانیجەنگی دەروونی دەگەڕێتەوە بۆ چاخە دێرینەکان و سەرەتای ململانێی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدا[٤]. هەر لە زووەوە مرۆڤ ویستویەتی ورەی دوژمنەکەی بڕوخێنێت. تووشی شڵەژاویو پەشۆکاویو سام و بیمی بکات. ئیرادەی تێک بشکێنێت، تاکو کۆڵی پێبدات و بەچۆکیدا بێنێت.

هەر بۆیە (صینی)یە کۆنەکان و میسریو گریک و گەل و نەتەوەکانی تر، بەدرێژایی مێژوو پەنایان بردۆتە بەر ئەم چەکەو لە ململانێکانیاندا بەکاریان هێناوە.

هەستیان بە رۆڵی کاریگەری کردووە. چونکە بنەڕەتەکانی دەروونی مرۆڤ و هێڵە گشتییەکانی لەوەتای ئادەمیزاد هەبووە هەروەکو خۆی بووەو ماوەتەوە. ئەگەر چی مەرج نیە لە مێژوودا وەک لقێکی زانست ناسرابێت و لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی لەسەر کرابێت. ئەوەی کە گەشەی کردووە لەجەنگەکەدا، ئامرازەکانیەتی شێوازو هۆکارەکانیەتی، ئەویش بەهۆی ئەو پێشکەوتنە گەورەی سایکۆلۆژیاو هۆیەکانی پەیوندی لەم یەک دوو چاخەی دوایدا بەخۆیانەوە بینیوە.

مێژووی خەبات و تێکۆشانی پێغەمبەرانی خوا پڕیەتی لە شێوازی جەنگی دەروونی جۆراوجۆر. کە دوژمنەکانیان لە دژیان بەکاریان هێناوە. کە

---

[٤] الحرب النفسية/ موسى زناد - بغداد/ ١٩٨٤ ص٧.

لەباسی شایعەو پروپاگەندەدا، وەک دوو ئامرازی سەرەکی جەنگی دەروونی ئەوەندەی بکریت ئاماژەی پیدەکەین.
ئەگەر زۆریش نەچینە قولایی میژووەوە، سەیر دەکەین سەرکردەیەکی بەسام و بەناوبانگی وەکو جەنگیزخان، کە لەدریژایی ژیانیدا کەم ریکەوتووە جەنگی بدۆرینیت. پیش ئەوەی دەست بەشەر بکات و هیزە چەکدارەکانی بەکاربهینیت، بەجەنگی دەروونی ورەی پیبەرداون و بەسەریاندا زال بووە. (خوارزم شا) بیمتمانەیی نیوان سولتان و سەرکردەسەربازییەکانی قۆستەوەو زۆر بە زیرەکانە بەکاری هیناو سودی لیوەرگرت.
کاتیک سولتان خوارزم لەگەل دایکیدا ناکۆکیان کەوتە نیوانەوە لەسەر بەدەستەوەگرتنی جلەوی دەسەلات و فەرمانرەوایی، ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکان سەر بە دایکی بوون. جەنگە دەروونیەکەی جەنگیزخان لەم خالەوە دەستی پیکرد. یەکی لە سەرکردەکانی شا بە ناوی (بدرالدین بن العمید) پەنای بردە بەر جەنگیزخان. جەنگیزخان ئەوەی بە هەل زانی دەستی کرد بە تەزویری چەندەها نامەو پەیامی جۆراوجۆر بەناوی میروسەرکردەکانی خوارزم شاوە کە گوایە داوایان لیکردووە پەنایان بدات و خۆیان بدەن بەدەستەوەو ئەمیش رەزامەندی نیشانداوەو ئەو داواکاریانەی ئیمزا کردووە. جا ئەم نامانەی دزە پیدەکردن و دەیگەیاندنە دەستی سولتان. کاتی سولتان ئەمەی بینی بەتەواوی بەرامبەر سەرکردەکانی بەدگومان بوو. بۆیە بریاریدا لەشیوەی تیپی سوپایی بچوک بچوکدا بلاوەیان پیبکات و هەریەکەیان رەوانەی ولایەتیک بکات. کەئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی هیزە مەغۆلیەکان زۆر بەئاسانی دەست بەسەر ولاتدا بگرن و بەهیزترین دەسەلاتی ئیسلامیی ئەو کاتە هەرەس بهینیت.
لەچەرخی نویشدا لەجەنگی جیهانی دووەمدا ئەم چەکە لەجاران زیاترو نەخشەدارتر بەکارهات. دەبینی پیاویکی وەکو (گۆبلز) کە وەزیری پروپاگەندەی هیتلەر بوو بوو بە کەسایەتی پلە سیی ولات. جۆش و خرۆشی خستە ناو گەلی ئەلمانیاوەو پۆل پۆل بەرەو مەیدانەکانی نەبەردو بەرەورووبونەوە ملیان دەنا. ئەفسانەی (ئەلمانیا لەسەرووی هەموانەوەیە)ی لی کردبوونە راستیو لەپیناو هینانەدیدا ئامادەبوون دەست لە هەمو وشتیکی خۆیان هەلگرن، گیانی خۆیان بکەن بە قوربانی.
جەنگی دەروونی ئەلمانیای نازی لە سەرەتاوە ئەوەندە سامناک بوو، پاریسی ئەو کاتە کە حەوت ملیۆن و حەوت سەد هەزار کەسی تیدا دەژیا،

پێش ئەوەی سەربازە نازیەکان بچنە ناوی دانیشتوانەکەی شاریان بەجێهێشت و داگیرکرا.

لە دەزگا مۆتەکەی گۆبلزدا چوار هەزار شارەزای دەروونناسیو پڕوپاگەندەو جەنگی دەروونی کاریان دەکرد. بۆیە لە دوای ئەم جەنگەوە واتە جەنگی جیهانیی دووەم. وڵاتانی جیهان لەوانەش ئەمریکا لە جاران زۆر زیاتر بایەخیان بە جەنگی دەروونی دا. بەجۆرێک تاکو ئێستاش لێکۆڵینەوەکان لەو بوارەدا هەر بەردەوامن و ڕۆژ بە ڕۆژ سوودی زیاتر لەم شێوازەی ململانێ وەردەگیرێت، پەرە بە شێوازەکانی دەدرێت و ئامرازەکانی نوێ دەکرێتەوە.

## مەترسیو بایەخی جەنگی دەروونی

جەنگی دەروونی واتای جەنگی کلاسیکی ناگەیەنێت، بەڵکو تەنها هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ بەدیهێنانی ستراتیژیەتی نەتەوەیی دەوڵەت، بەجۆرێک لەکاتی شەڕو ئاشتیدا وەک یەک بەرپادەکرێت و هەمو تواناکانی دەوڵەتی تیا بەکاردێت.

جەنگی دەروونی مرۆڤ تووشی هەڵدێری شڵەژان و دڵەڕاوکێو نائارامی دەرونیو کۆمەڵایەتی دەکات. ئێستا بیر لەوە دەکرێتەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەیەکجاری ئەم جەنگە جێگای جەنگی گەرم بگرێتەوە،یان هیچ نەبێت لە زۆر کاتدا جێگای بگرێتەوە. جەنگ تەنها بەکارهێنانی چەک لە دژی چەک نییە. *ئێستا چەمکی جەنگ گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە. لەجەنگی کلاسیکیەوە گۆڕاوە بە جەنگی هەمەلایەنە. بەڵێ جەنگ شەڕی ئیرادەیەلە دژی ئیرادە. هەر بۆیە ئێستا ئاراستەکردنی دەروونیو مەعنەوی لەناو ریزەکانی سوپادا گرنگیەکی زۆری پێدەدرێت. چونکە جەنگ لە دوو ڕەگەزی ماددیو مەعنەوی پێک دێت. خۆ ئەگەر سوپایەک چەک و جبەخانەیەکی زۆر مۆدێرنیشی لەبەردەستدا بێت، بەڵام خاوەنی ویستێکی بەهێزو ورەیەکی بەرزو گیانی فیداکاریو لێبڕان نەبێت، سەرەنجام شکست دەخوات.*

ئەوەتە سەرکردەی چینی (من تزو) لەسەدەی پێنجەمی پێش زایینـدا دەڵێت: *(لوتکەی ویستی دوژمـن تێکبشکێنیو بـەبێ شـەڕ جەنگە لـە بەرێتەوە)*.

دیارە لە زۆر کاتدا مەبەست لە شەڕ تـەفرو توناکردنی دوژمـن نییـە، بەڵکو چۆکێ پێدادان و ملکەچ کردنیەتی بۆ کۆمەڵێ ئامانج و داخوازی کـە زۆرجار بـەکارهێنانی زەبرو زەنگ ناخوازێت و چەکێ دەبێتـە دواهـەمین چارەسەر.

زۆرجار بەتەنها ئامـاژە کـردن بـۆ بـەکارهێنانی هێز لـە بـەکارهێنانی بەهێزترە. هەروەکو ڕاگەیاندنی (جیهاد)ی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە جـەنگی جیهـانیی یەکـەمدا کەلەڕاستیدا: *(سـولتان بەهەڵـەداچوو کـە جیهـادی ڕاگەیاند، چونکـە ڕۆژئـاوا حسـابێکی زۆری بـۆ ئـەو مەسـەلە دەکـردو لـێی دەترسا. ئەگەر سولتان تەنها هەڕەشەی بەکارهێنان و ڕاگەیاندنی پێبکردایە چەندان قـات زیـاتر دەروی دەبـوو. چۆکپێدادانـی دوژمـن لـەرێی شـێوازو ئامرازەکـانی جـەنگی دەروونیـیەوەو دوورخستنـەوەی لەجـەنگی خوێنـاوێی بەتایبەتی کەلەم سەردەمەدا بەهۆی چـەکی مۆدێرنـەوە کارەساتە مـاددیو مرۆییەکانی جەنگی گەرم زۆر ترسـناکتر بـووە*. دەوڵـەت خـۆی لـە خـەرجی زۆری جـەنگ و چاککردنـەوەی شـوێنەوارە کاولکاریـەکانی ڕزگـار بکـات و بەهـەرزانترین شێوەو کـەمترین قوربـانی ئامانجـە نەتەوەییـەکانی خـۆی بەدەست بێنێت. هەروەک سەرکردەیەکی ئەڵمانی ئاماژە بەم خاڵە دەکات و دەڵێت: *(ئێمە بۆمبایەکی زۆر بەکار دەهێنین، بۆ ئەوەی تۆپێک لەدەستی سەربازێکدا بشکێنم ئایا بۆ ئێمـە هـەرزانتر ناکـەوێ هۆکـارێک بدۆزینـەوە پەنجەکانی ئەو سەربازە تێکبدەین کە تۆپەکە دەتەقێنێ؟)*.

جیهان خۆرانیش دەرکیان بەم ڕاستیە کردووەو لـە زۆربـەی شـوێنەکانی جیهاندا وازیان لە داگـیرکردنی سـەربازی ڕاستەوخۆ هێنـاوە. دوای ئـەوەی عەقڵی وڵاتە دواکەوتووەکانیان بە جـۆرێ پـەروەردەکرد لەگـەڵ بـەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیاندا بگونجێت. لەڕێگای شێوازەکانی جـەنگی دەروونیـەوە یـاری بـە چارەنوسـی میللـەتان دەکـەن و دەستکاری نەخشـەی جوگرافـیو سیاسیو ئایدۆلۆژی دنیا دەکەن. جەنەڕاڵی ئەمریکی (جیمـس جـانین) لـەم بـارەوە دەڵێـت: *(ڕۆژئـاوا چـاوی بـەتێکڕای سـتراتیژیەت و سروشـتی جەنگەکاندا گێڕاوە. چونکە نەخشە ستراتیژییە نوێیەکان بایەخ بە هوکـاری*

*سایکۆلۆژی و تایبۆلۆژی دەدات. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین، جەنگی ئەمڕۆ بۆتە جەنگێکی سایکۆلۆژی هەمەلایەنە).*

هەر بۆیە ئەمڕۆ بڵندگۆ راگەیاندنەکانی زلهێزەکان شاڵاوی جەنگێکی دەروونی رێکخراو بەیارمەتی هاوکارە ناوچەییە خۆماڵییەکان دەکەنە سەر ئیسلام و پرۆژەی هەڵسانەوەی میللەتانی ناوچەکەو خەباتیان بۆ گێڕانەوەی ناسنامەو سەربەخۆیی راستەقینە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هیچ سەرکەوتنێکی سەربازی سوودی نیە ئەگەر نەبێتە هۆی رووخاندنی ورەو خۆڕاگری بەرامبەرو تووشی شکستی دەروونیی نەکات. بۆ نموونە لەجەنگی جیهانیی دووەمدا یابانیەکان زەبرێکی کاریگەریان ئاراستەی گەلە کەشتییە ئەمریکا کرد. بەڵام بەرەنجامی کۆتایی هێرشەکە بەزیانی یابانیەکان تەواوبوو. چونکە هێرشەکە بوو بەهۆی یەکخستنی ریزی ئەمریکییەکان، نەک رووخاندنی ورەیان.

## شێوازەکانی جەنگی دەروونی

جەنگی دەروونی بەحوکمی بەرفراوان بوونی هەموو شێوازەکانی ململانێ دەگرێتەوە. دەتوانین بڵێین هیچ شێوازێکی (مادی یاخود مەعنەوی) نییە کە جەنگی دەروونی لە خزمەتی خۆیدا بەکاری نەهێنێت. بەڵکو هەندێ لێکۆڵەرەوە لەسەر ئەو بیروڕایەن کە جەنگی گەرم خۆشی شێوازێکی جەنگی دەروونییە. بۆیە ***بەشێوەیەکی گشتی جەنگی دەروونی ئەم شێوازانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە:***

### یەکەم : کوشتار :

*کە بریتییە لە یەکلایی کردنەوەی مادی لەجەنگی دەروونیدا*. وە بریتییە لە رواڵەتی خوێناوی بڕیارە دەروونیەکان بۆ جەنگ و ململانێ لەپێناو ئەنجامێکی دیاریکراودا. لەبەرئەوە دەبێ بە پلەی یەکەم بایەخ بە دەروونی جەنگاوەر بدرێت و بەهێز بکرێت. وای لێبکرێت باوەڕی بە سەرکەوتن پتەوبێت. لە مێژوودا ئەوە سەلماوە کە سوپایەک سەرکەوتووەو ورەی بەرزتری هەبووە. گەر بەشێوەیەکی کاتیش تێک بشکێ بەڵام ورەی

لەدەست نەدات و نەڕوخێت، پەند لە تێکشکانەکەوە وەردەگرێت و نەبەزانەتر دێتەوە مەیدان و نەیارانی بە چۆکدا دێنێ. هەروەها بۆمبارانکردنی خاپوورکەرو بەکارهێنانی چەکی کوشندەو کۆمەڵ کوژو دەست وەشاندنی بێبەزەییانەو هێرش کردنە سەر ناوەندە مەدەنییەکان هەر هەمووی بەمەبەستی خۆبەدەستەوەدانی دوژمن ئەنجام دەدرێت.

## دووەم : جەنگی ئابووری :

کە پشت بەو ڕێسایە دەبەستێت کە دەڵێ: (*هەر زیادبوونێک لە بژێویمدا کەمی لەهێزی دوژمنەکەمدا دەگەیەنێت، هەر کەمیەکیش لەهێزی دوژمنەکەمدا زیادبوونی بژێویم دەگەیەنێت*).

جەنگی ئابوری واتە نەهێڵی کەرەسەو خۆراکی پێویست بگاتە دەست دوژمن، ئەمە لەلایەک، پەکخستنی توانا بەرهەم هێنانەکانی لەلایەکی ترەوە. دەرکردنی دەوڵەتی دوژمن لەبازاڕە جیهانیەکان و بەکارهێنانی ڕێو شوێنی گومرگی توند لە بەرامبەر کاڵاهێنان و بردنیدا، دابەزاندنی نرخی بەرهەمەکانی وەکو نەوت، وێرانکردنی دامەزراوە ئابوریەکانی لەڕێی بۆمباران و تۆپباران و کاری تێکدەرانەوە.

ئابڵوقەدانی جزئی یان گشتی وڵات و بڕینی یارمەتیەکانی. وەک ئەو یارمەتییە ساڵانەی هەندێ دەوڵەت لە وڵاتە زلهێزەکان وەریدەگرن. قەرزارکردن و دانانی سوودێکی زۆر لەسەر قەرزەکەو دواتر بەو بۆنەوە دەست خستنە ناو کاروباری ناوخۆی وڵات. تەزویرکردنی دراوی وڵاتێک و ...هتد. هەموو ئەم ڕێو شوێنانەو چەندانیتر لەفشاری ئابوری بەکاردەهێنرێت و پاروەنانی ڕۆژانەی گەل و شیری منداڵانی ساوا زۆر ناجوامێرانە دەکرێت بەچەکی چۆک پێدادانی بەرامبەر کە زۆرجار ئەو بەرامبەرە ڕژێمێکەو بەسەر گەلەکەیدا سەپاوە. ئێستا فشارو ئابڵوقەی ئابوری یەکێ لەکاریگەرترین ئەو چەکانەیە دژی هەندێ لە وڵاتانی جیهانی سێو بەتایبەتی وڵاتانی ئیسلامی بەکاردێت. تەنانەت زلهێزەکان دژ بە یەکیش بەکاری دەهێنن بۆ دەستکەوتنی بەرژەوەندی زیاتر.

سیاسەتی برسیکردنی بەرامبەر سیاسەتێکی کۆنەو هەر لەمێژەوە وەکو چەکێ بەکارهاتووە. ئەوەتە یەکێ لەو چەکانەی سەرۆکانی شیرک و ستەم لەسەرەتای ئیسلامەوە دژی پێغەمبەری مەزن ﷺ و هاوەڵە

تێکۆشەرەکانی بەکاریان هێنا نابلۆقەدانیان بوو لە شیوی (أبـي طـالب)دا. بـەجۆرێک خـەڵکی قەدەغــەبوو کڕیــن و فرۆشــتنیان لەگــەڵدا بکــات و پێداویستیەکانی ژیانیان بگاتێ. تەنانەت کار گەیشتە ئــەوەی ناچـاربن گـژو گیا بخۆن.

ئەوەتە لە سورەتی (المنافقین)یشدا دوڕووەکان بەو کارتە هەڕەشە لــە باوەڕداران دەکەن و قورئان لەسەر زمانی ئەوانەوە دەفەرموێت: (لاتنفقوا علی من عند رسول الله حتی ینفضـوا) المنافقون/٧. واتــە *یارمـەتی لـە هــەموو ئەوانــە بگرنەوە کە بەدەوروبەری پێغەمبەری خواوەن ئیـتر ئەمـە وایـان لێ‌دەکـات بڵاوەی لێبکەن و پەرەوازە ببن.*

لە سەردەمی نوێشـدا ئینگلیزەکـان وەک داگیرکـەرێ بـەوە بـەناوبانگ بوون کە سیاسەتی هەژارکردنی ئــەو گەلانــە دەگرنــە پێـش خستویاننە ژێـر دەســەڵاتی خۆیانــەوە. بۆ ئــەوەی توانـای راپـەڕین و بــەرگرییان نــەمێنێ. هەروەها لەبەر ئەو چاوچنۆکی‌یە زۆرەی پــێی ناسـرابوون کـە بـەخێرو بـێری پێنج یەکی ئەم سەرزەوی‌یە تێریان نەدەخوارد، کوردو شۆڕشەکەیشی زۆرجار ئەم چەکەیان لەدژ بەکارهاتووە.

## سێهەم : جەنگی سیاسی:

*ئەم شێوازەش بە پلەی یەکەم دەیەوێت دوژمن لەناوخۆدا گەمارۆ بدات و ورەی بڕوخێنێ‌و لـە هاوسۆزی‌و پشـتیوانی رای‌گشــتی دەرەوە بێ‌بەشــی بکات.*

جەنگی سیاسی شێوەی جۆراوجـۆر بـەخۆوە دەگرێـت، وەک: هەڕەشـەی بەردەوام بە هەڵگیرساندنی جـەنگ وەک کـە هیتلـەر کـاتی‌خۆی دەیکـرد، جموجوڵی گەلە کەشتی‌یە جەنگی‌یەکان، بەستنی هاوپەیمانی، ئــەنجامدانی مانۆڕی سەربازی‌و ئامــاژە کـردن بەبەکارهێنانی چـەکی قڕکـەرو وێرانکـەر. چــالاکی دیبلۆماســی بەمەبەسـتی بەدەســتهێنانی لایــەنگیری دەوڵەتــە بێلایەنەکان بۆ کێشـەیەکی دیاری‌کراو دەنگدان بۆ قــازانجی ئـەم رێکخـراوە نێودەڵــەتی‌و ناوچەیی‌یــەکاندا. لێدوانــی (اســتفزاز)ی لــە راگەیاندنەکــەی پــەیمانی ئەتڵەسـی دوای جـەنگی (١٩٦٧) بــەوەرگرتنی ئیســرائیل لــەو پەیمانەدا، کڕینی چەک و تاقی‌کردنـەوەی چـەکی جۆراوجـۆرو پێشـکەوتوو، پێشوازی کردنی لە کەسایەتی‌یە سیاسی‌و فکری‌و کۆمەڵایەتی‌یە نــەیارەکان،

وەک پێشوازیکردنی کلنتۆن لە سەلمان روشدی یان چاوپێکەوتن و پێشوازی لێکردنی چەندان جارەی ڕێبەری ئاینی هەرێمی (تبت) لەچیندا لەلایەن کۆشکی سپی و ناوەندە بڕیاربەدەستەکانی تری رۆژئاواوە. هەروەها دەرخستنی هەندێ بەڵگەنامەو پەیماننامەی نهێنی، تاوانبارکردنی رژێمەکان بەژێرپێداتی مافی مرۆڤ، ناوبردنی شۆڕشگێڕان بە ترۆریست و هەڵگەڕاوەو یاخی، خۆمان ئاگادارین چۆن لەم بەشە کوردستانەدا شۆڕشگێڕانی کورد بە (متمردین و عصاة) ناودەبران. ئەمانەو دەست پێشخەری جۆراو جۆری تر هەر هەموو ئەمانەو چەندان شێوەی تر دەچێتە خانەی جەنگی سیاسییەوە. بەڵام پێویستە ئەوە بڵێین کە هەرچەندە لەم جەنگەدا فرۆفێڵ و چاوبەستەکردنی زۆر بەکاردێت بەڵام لەماوەیەکی دووردا مادام پشت بە هەق نابەستێ ناتوانێت بەتەواوی سەرکەوێت و ئامانجەکانی بەدی بێنێ.

## چوارەم : پڕوپاگەندە :

زاراوەیەکی لاتینییە (Propaganda) واتا: *شێوازێکی نەخشە بۆ کێشراوە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕێ یان بیرێ یاخود هەواڵێ.* لەبنەڕەتا لەفەرمانی (Propaganda) داتاشراوە کە مانای زۆرکردنی دارستان لەرێی ئاشتنی نەمامەوە دەگەیەنێ. بەڵام ئەم زاراوەیە لەسەردەمی کەنیسەی کاثۆلیکی رۆمانیدا پەرەی سەندو مانایەکی نوێی بەخۆوە گرت کەبریتییە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری. بە واتای زۆرکردنی پڕوپاگەندە دەشێ ئاراستەی دوژمن و بێلایەن بکرێ. وە لەسەر بناغەی سایکۆلۆژی و کۆمەڵناسی و سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتی دامەزراوە. لەهەردوو کاتی شەڕو ئاشتیدا بەکاردەهێنرێ.

دەتوانین بەم جۆرەش پێناسەی بکەین و بڵێین: (*پڕوپاگەندە بریتییە لە بەکارهێنانی شێوە جۆربەجۆرەکانی ڕاگەیاندنی گشتی یاخود میللی بەمەبەستی کارکردنە سەر سۆزو عەقلی کۆمەڵێکی دیاریکراو بۆ مەبەستێکی دیاریکراو، سا ئەم مەبەستە سەربازی بێ، ئابوری بێ، یان سیاسی*).

هەروەها بەم جۆرەش پێناسە كراوە: شێوازێكە لەشێوازەكانی ئاراستەكردنی دەروونی كە هەڵوێست گرتن یاخود رادەربڕینێكی بەدوادا دێ، كە بەبێ ئەو نەدەشیا بیان گەینێ.

*پڕوپاگەندە لە كۆمەڵگای هاوچەرخی سیاسیدا بە جەوهەری مومارەسەی سیاسی دادەنرێت. لەهەمان كاتدا ئامرازی دەسەڵاتی سیاسی فەرمانڕەوایە بۆ مومارەسەكردنی سیاسەتی ناوخۆو دەرەكی. ئەمەش لەبەر دوو هۆكاری گرنگ :*

١- ئەو پێشكەوتنە مەزنەی هۆیەكانی گەیاندن بەخۆیەوە بینیوە. كە مرۆڤایەتی بەجۆرێكی زۆرسەیر لێكتر نزیك كردۆتەوە. ئەمەش مۆركی خۆی بەسەر هاوولاتی سادەو رژێمە سیاسیيە هاوچەرخەكاندا بەجێهێشتووە. لە رووكاری جۆری پەیوەندی نێوان فەرمانڕەواو جەماوەری خەڵكدا.

٢- سروشتی جەماوەری كۆمەڵگای سیاسی هاوچەرخ، كە ناوەرۆكەكەی بریتیيە لە بەشداریكردنی هاوولاتی سادە لە پرۆسەی دەركردنی بڕیاری سیاسیدا. جا ئەم بڕیارە لەسەر ئاستی ناوخۆ یان دەرەوە بێت. هەروەها خستنە ژێر چاودێری رەفتاری فەرمانڕەواو لێپرسینەوەی.

پڕوپاگەندە دەبێت زۆربەی كات لەسەرچاوەیەكی رەسمیەوە ئاراستە بكرێت، تا بەپێی بەرنامەو نەخشەیەكی داڕێژراو لەچوارچێوەی سیاسەتی گشتیدا بخرێتەكار و ئامانجی دیاریكراو بەدی بێنێت.

دیارە ئەو دەوڵەت و هێزانەی توانای ماددییان باشەو بارودۆخیان بۆ گونجاوە، دەزگاو مەڵبەندی تایبەتی توێژینەوەو لێكۆڵینەوەو ئاراستەكردنی پڕوپاگەندەیان دامەزراندووە. زاناو پسپۆڕی سایكۆلۆژیو كۆمەڵناسیو شارەزای پڕوپاگەندەیان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان كردووە. كە ئەمە زیاتر لە دەوڵەتە گەورەكانی جیهاندا بەدی دەكرێت.

بەڵام دەوڵەتە بچوك و رێكخراوە سیاسیيەكان ئەگەر دەزگای تایبەتی پڕوپاگەندەشیان نەبێت، ئەوا لەرێی سیاسەتی گشتیو سەركردایەتیو راگەیاندنەوە، رەچاوی پڕوپاگەندەو وروژاندن و هاندان دەكەن.

پڕوپاگەندە بەگوێرەی دیدی ئایدۆلۆژیو رێبازی سیاسی جۆری راست و درۆی هەیە[1] بۆئەوەی پڕوپاگەندە بەچاكی كاری خۆی بكات و بچێتە ناو

---

[1] كۆمەڵە، گۆڤاری كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستان، جەنگی سایكۆلۆجیو شۆڕشی كوردستان، ژمارە١٦ خولی ٣ نیسانی ١٩٨٧ لا٤٠.

میشک و دەروونەوەو بڕوای پێبکرێت. پێویستە زانیاری وردو قووڵ دەربارەی ژیانی ئابووری، سەربازی، سیاسی، مێژوویی، ئایدۆلۆژیو داب و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵەی ئاراستەی دەکرێت لەبەردەستدا بێت.
*کاریگەریش بەستراوە بە دوو شتەوە:*

١) گرنگی ئەو بابەتەی پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێت و نزیک بوونی لەژیانی خەڵکیو پەیوەستبوونی بە چارەنووسیەوە.

٢)ئەو هۆو شێوازەی پڕوپاگەندەکەی پێبڵاودەکرێتەوە تا رازاوەو سەرنج راکێش و سەرکەوتووتر بێت لە رووی هونەرییەوە،کاریگەرتر دەبێت.[1]

*گەر سەیری سەرجەم پێناسەکانی پڕوپاگەندە بکەین دەبینین زۆربەیان پەککەوتوون لەسەر* :

١- پڕوپاگەندە دەیەوێ وەڵام دانەوەی ئاینده بەو جۆرەی کەپەیامی پڕوپاگەندەکە دەیەوێ بگۆڕێ، کە نێرەری پەیامەکە دەیەوێ لەمیانەی ئەوەوە بگاتە ئەو وەڵام دانەوەی مەبەستیەتی.

٢- پشت بە فشاری سۆزو زەوتکردنی دەروونی بەهۆی ئامرازی جۆربەجۆرەوە دەبەستێ. کە هەندێکیان لە بازنەی رەوشت دەچنە دەرەوە بەمەبەستی بەدیهێنانی هەستێکی سلبی یان ئیجابی گشتی بەرامبەر ئەو کێشەیەی دەیخاتە ڕوو.

٣- بەم واتایە کەواتە پڕوپاگەندە هونەرە، سەرەڕای ئەوەی کە شالاوی پڕوپاگەندە شێوازی زانستی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی پەیڕەو دەکات، بریتییە لە هونەر چونکە لەیەکەم جارو دوایەمین جاردا بەپلەی یەکەم پشت بە لێهاتنە کەسییەکانی ئەو کەسە دەبەستێ هەڵدەستێ بە شالاوەکە، وە بەتایبەتیە ساکۆلۆژیەکانی ئەو کەسەی ئاراستەی دەکرێت و ئەو کەش و هەوا دەروونیەی دەوری داوە.

## پڕوپاگەندە لەمێژوودا

هەرچەندە ئەم زاراوەیە پێش سەدەی (١٧) نەناسراوە، بەڵام شێوازی جۆربەجۆری چالاکی پڕوپاگەندەیی هەر لەدێر زەمانەوە، بەکارهاتووە.
فیرعەونەکان شێوازی پڕوپاگەندەیان لەکاتی جەنگەکانیاندا بەکارهێناوە.

---
[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤١٧.

یۆنانیەکان زۆر هەڵکەوتووبوون لە بەکارهێنانی شێوازەکانی پروپاگەندە بۆ هێنانەدی ئامانجە سیاسیو سەربازییەکانیان لەڕێی خوتبەو شیعری حەماسییەوە.
رۆمانیەکانیش شێوازی تایبەتی خۆیان هەبوو بۆ سەرکەوتن بەسەر پروپاگەندەی دوژمندا بەنزیکترین کات و بەکارهێنانی شیعر بۆ وروژاندنی هەستی میللیو نیشتمانی.[2]

## پروپاگەندە لە مێژووی ئیسلامیدا

ئیسلام لە بوعدێکی عەقیدەی دا پروپاگەندە. کە لە زمانی هەق و لۆجیکی ئیمانەوە سەرچاوەی دەگرت. کە ئەمەش تاقە لۆجیکی سیاسەتی دەرەوەبوو، بەڵام ئەم پێگانە تووشی شێوان هات، ئەمەش کاتێ دەوڵەتی ئەمەوی هەڵسا بەوەی بوعدێکی سیاسی بەسەردابڕی ئەمەش بەبەکارهێنانی شێوازی زۆرەملێو ناوزڕاندن و هەڵبەستنی فەرموودە بەدەم پێغەمبەرەوەو دروست کردنی کەسایەتیو درۆو دەلەسە بۆ ئەوەی شەرعیەتی سیاسی نەوەکانی ئومەییە بسەلمێنێ.
بەڵام بزوتنەوەی عەبباسیو فاطمی پروپاگەندەیان کرد بە چەکی بنەڕەتی دەستیان بۆ دروست کردنی لایەنگرو سازکردنی رای گشتی بۆ گۆڕانکاری کردن لە بونیادی دەوڵەتدا بانگەوزازی عەبباسی شێوازی جۆربەجۆری بەکارهێنا بۆ دواندنی هێزە نەیارەکانی حوکمی ئەمەوی. یانی هەموو کۆمەڵێ کە نەیاری ئەمەوییەکان بوون بەجۆرێ دواندوویانە کەلەگەڵ بیروڕاو ئاواتەکانیاندا سازگاربێ، بەڵکو هەر لەناو ئەم کۆمەڵانەدا بانگەوازکەریان دروست کردووە، فاطمیەکان بەئەزمونێکی نوێوە پروپاگەندەی خۆیان دەست پێکرد. مەبەستی بنەڕەتی لە دروست کردنی زانکۆی ئەزهەردا بەکارهێنانی دەزگای فێرکردن بوو بۆ بلاوکردنەوەی بانگەوازی فاطمي، هەروەها شیعریان بەکارهێناوە. ئەنجومەنێکی بانگەوازیان پێک هێنا بەسەرۆکایەتی (بانگخوازی بانگخوازان) کە (١٢) کەس یارمەتیدەری بوون، کەهەریەکەیان نوێنەری ئەنجومەنەکە بووە لەناوچەیەکی میصردا.

---

[2] الدعاية الايرانية والدعاية الاسرائيلية/ عصام فاهم جواد العامري/ل٢٦-٢٧.

# پێغەمبەران و جەنگی پڕوپاگەندە

گەر چاوێ بە ژیاننامەو کارو خەباتی پێغەمبەرانی خواداو ململانێیان لەگەڵ خۆسەپێنەرانی نەتەوەکانیان بخشێنین، سەیردەکەین دەزگای دەسەلاتداری کۆمەڵگا ویستویەتی جەنگێکی پڕوپاگەندەی سەختیان لە دژ بەرپا بکەن. تا لەم رێیەوە دڵی خەڵکیان لێساردکەنەوەو سیمای خۆیان و بانگەوازەکەیان بشێوێنن، لێرەدا حەزدەکەم ئاماژەیەکی کورت بۆ چەند نموونەیەک لەو بارەیەوە بکەم:

١) نوح پێغەمبەر ﷺ سەیردەکەین نەتەوەکەی نوح بەوە تاوانباری دەکەن کە (یرید أن یتفضل علیکم) المؤمنون/١٤. واتە نوح دەیەوێت لەئێوە بەرێزتر بێت و خۆتان بەسەردا بسەپێنێ! رون و ئاشکرایە کە ئەمە قسەی دەسەلاتدارانی زۆردارانی روو بەجەماوەرە رەش و رووتەکەیە بۆ ئەوەی شوێن بانگەوازەکەی نەکەون و هەر لە سەرەتاوە بەربەست لەنێوان ئەمان و (نوح)دادروست بکەن. لەلایەکی ترەوە (نوح)و هەموو ئەو باوەڕدارانەی باوەڕیان پێهێناوە بەدرۆزن لەقەڵەم دەدەن (بل نظنکم کاذبین) هود/٢٧. ئێمە لێمان روونە کە لەبانگەوازەکەتاندا راست ناکەن.

سێهەم جار زۆر بەتوندی بە سەرلێشێواوی تۆمەتباری دەکەن (إنا لنراك في ضلال مبین) ئێمە تۆ -واتە نوح- لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین.

ئیتر چۆن مرۆڤێکی گومڕا دەتوانێت رێنمویی خەڵک بکات؟

٢) **هود** : نەتەوەکەی هود بە گێلیو درۆزنی تاوانباری دەکەن (إنا لنراك في سفاهة و إنا لنظنك من الکاذبین) الأعراف/٦٧.

سەرنجێکی دەروونی ئەوە دەردەخات کاتێ باسی تاوانبارکردنی پێغەمبەرانە بە درۆزنی، دەستەواژەی (وا گومان دەبەین) بەکاردەهێنن، چونکە لەبەرەنجامی تاقیکردنەوەیەکی دوروو درێژی نەتەوەکاندا راستگۆیی پێغەمبەرانیان لا رۆشن بووە. لەبەرئەوە جەخت کردنەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە گەمژەیێ نەبێ هیچی تر ناگەیەنێت. ئەگەرچی پڕوپاگەندەکان هەمان ئاکامیان لێدەکەوێتەوە.

بەڵام کاتێ باسی گومڕاییە زیاتر پێ دادەگرن چونکە خەڵکەکە بەئاسانتر باوەڕی پێکردووە. چونکە بانگەوازی پێغەمبەران لەگەڵ بیروباوەڕو ئەو واقعەی خەڵکەکەی تیا ژیاوە ناکۆک بووە. بەڵکو لە بنەڕەتدا پەیامەکە بۆ گۆڕینی هاتووە.

هەروەک لە دەقە قورئانییەکانیشدا ڕۆشن دەبێتەوە سەرکردایەتی کۆمەڵگای نەفامی لەو کاتەدا شالاوی پڕوپاگەندەکەی بەرپا کردووە. چونکە پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییە نارەواکانی خۆیان لە دژایەتی کردنی بانگەوازی پێغەمبەراندا بینیوەتەوە. لەولاوە بۆ ئەوەی لەم ڕێگایەوە کونترۆڵی دەروونی جەماوەریان بەدەستەوە بمێنێتەوە.

خەڵکە نەزانەکەش پڕوپاگەندەکانیان دووبارە دەکەنەوەو دەڵێنەوە نەتەوەکەی هود دەڵێن خواوەندەکانمان لە هود توڕەبوون و عەقڵیان تێکداوە لەبەرئەوەلەدژی داب و نەریتەکانی کۆمەڵگا خەریکی وڕێنەکردنە.

( قالوا یاهود ما جئتنا ببینة وما نحن بتارکي آلهتنا عن قولك وما نحن لك بمؤمنین إن نقول إلا اعتراك بعض آلهتنا بسوء قال إني أشهد الله وأشهدوا أني بريء مما تشرکون) هود/٥٤،٥٣.

*وتیان ئەی هود تۆ بەڵگەت لەسەر ڕاستی بانگەوازەکەت بۆ نەهیناوین و پێ نییە. لەبەرئەوە ئێمە لەبەرخاتری قسەکانی تۆ واز لە خواوەندەکانی تۆ ناهێنین و باوەڕت پێناکەین.*

*ئەوەی دەیڵێی بەرەنجامی عەقڵ تێکچونێکە لەلایەن خواوەندەکانمانەوە. (هود)یش ڕووبەڕوویان فەرمووی: من خوا دەگرم بە شایەت و خۆشتان شایەت بن کە لەهەموو ئەو شتانەی دەیانکەن بە هاوەڵی خواو بیروباوەڕی یەکتاپەرستی لێل دەکات، بێبەریم .*

(٣) **موسا** عليه السلام : ئەوەتە فرعەون دنیا لە موسا پڕدەکات و ڕووبەڕووی خەڵکە سەرلێشێواوەکە دەڵێ: (إن هذا لساحر علیم یرید أن یخرجکم من أرضکم فماذا تأمرون) الشعراء/٣٤.

بەڕاستی ئەو کابرایە هەتا بڵێی جادووگەرێکی لێزان و شارەزایە. دەیەوێ بەجادووەکەی لەخاک و ئاوی خۆتان دەرتانکات جا ئێوە چی دەڵێن؟

تاوانبارکردنی حەزرەتی مووسا بە جادووگەری، لەچەندەها شوێنی قورئانداو بەشێوازی جۆراوجور لەلایەن فرعەونەوە دووپات کراوەتەوە.؟

ا) لەشوێنێکی تردا فیرعەون موسا بەوە تاوانبار دەکات کە شێت و درۆزنە.

(إلی فرعون وهامان وقارون فقالوا ساحر کذاب) غافر/٢٤.

(فتولی برکنه وقال ساحر أو مجنون) الذاریات/٣٩.

دستەو دایەرەی دەوربەریشی هەمان قسەوان لێدەدەنەوە:

( قال الملأ من قوم فرعون إن هذا لساحر علیم) الأعراف/١٠٩.

لە قۆناغی سێهەمیشدا جەماوەرەکە هەمان شت ڕووبەڕووی موسا دەکەنەوە. (فلما جاءهم الحق من عندنا قالوا إن هذا لساحر مبين) یونس/٩٧.
( فلما جاءهم موسى بآياتنا قالوا إن هذا إلا سحر مفترى) القصص/٣٦.
ب) جارێکیتر بەخراپەکار ناوی دەبەن کە خەریکی خراپەنانەوەیە لەسەر زەویدا (أتذر موسى وقومه ليفسدوا في الأرض) بەپرسیارو سەرسوڕمانەوە باسی ئەوە دەکرێت چۆن دەبێت موسا هەروا وازی لێبهێنرێت بۆ ئەوەی لەسەر زەویدا خراپەکاری بکات.
ج) لەلایەکی ترەوە وا دەردەخەن کە موسا تەنها *شێتی کورسیو پلەو پایەو* سەرۆکایەتیو خۆدەرخستنە (إجئتنا لتلفتنا عما وجدنا عليه آباءنا وتكون لكما الكبرياء في الأرض) یونس/٧٨.
د) پروپاگەندەیەکی ژەهراوی فیرعەون دژی موسا بریتیبوو لە (مهين ولا يكاد يبين) الزخرف/٥٢. کەدەیەوێت سوکی کات و وای بخاتە ڕوو *کەسایەتییەکی دیارو ناسراوو خاون پلەو پایەو شکۆنییە.*
هـ) تاوانبارکردنی (موسا) بەوەی *سپڵەو بەدنمەکەو چاکەی لەبەرچاو نییە* (ألم نربك فينا وليدا ولبثت فينا من عمرك سنين) الشعراء/١٢. ئایا تۆ منالێ نەبوێت و ئێمە پەروەردەمان کردی؟ چەندان سالی تەمەنت لامان بەسەر نەبرد؟ وەک بلێ ئایە ئەمەیە پاداشتی ئەو چاکانەت بۆ ئێمە کە ئاوا دژایەتیمان بکەیت و خەلکمان لێهاندەی.
و) تاوانبارکردنی (موسا) *بەبێباوەڕیو خوا نەناسی!* بۆ ئەوەی خەلکەکە باوەڕی پێنەکەن. بەلگەی فرعەونیش بۆ سەلماندنی ئەو تۆمەتەی ئەوەیە کە (موسا) لەسەرەتای لاویدا ( قبطی )یەکی کوشتووە. (وفعلت فعلتك التي فعلت وأنت من الكافرين).
وەک ئەوەی بلێ ئەگەر یەکێ باوەڕی بەخوا هەبێ چۆن دەبێت شتی وای لێبوەشێتەوە.
سەرەڕای هەموو ئەم بوختان و درۆو دەلەسەو پڕوپاگەندە ناڕەوایانە دژی موسا. کە ڕۆژی خۆی هاتە پێشەوە هەق سەرکەوت و ناهەقی ڕامالی. جادووگەرەکانی فرعەون لەبەردەم جەماوەردا باوەڕیان هێنا. فرعەون لەبەردەم ئەم دیمەنەدا تێکچوو شپرزەبوو. جارێکیتر بەفێل و تەلەکەبازی پەنای بردەوە بەر بەکارهێنانی پڕوپاگەندەو درۆو دەلەس.
بەخەلکەکەی وت کە ئەم کارە بەرێکەوتنێکی لەوەوپێشی نێوان موساو جادووگەرەکان ئەنجام دراوە. لەبەرئەوە کڕنۆش بردن و

باوەڕهێنانەکەیان تەنها سیناریۆیەو پیلانێکی دوو قۆڵی هاوبەشە بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیانە.

(إن هذا لمكر مكرتموه في المدينة لتخرجوا منها أهلها فسوف تعلمون) الأعراف/١٢٣.

سەرەنجام هەبق سەردەکەوێو موساو (بني إسرائيل)ـەکان لە میسر دەردەچن. بەڵام تۆ بڵێی موسا دوای ئەمە لە پڕوپاگەندەی ناحەزان رزگاری ببێت؟ ئایا لەچنگی ئازاردان قوتاری دەبێت؟ نەخێر، بەڵکو لەوە بەدوا بەدەست خودی (بني إسرائيل)ـەکانەوە تووشی ئازارو ناڕەحەتی دێت. ئەوەتە قورئان باسی ئازاری (موسا)مان بەدەست نەتەوەکەیەوە بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: (وإذ قال موسى لقومه يا قوم لم تؤذونني وقد تعلمون أني رسول الله إليكم) الصف/٥.

ئەوەتە موسا بەرامبەر گەلەکەی دەفەرموێت. گەلی برای ئەری لەبەرچی وا ئازارم دەدەن. لەکاتێکدا چاك دەزانن کە من پێغەمبەری خوام و بۆ ئێوە رەوانە کراوم؟

(٤) **پێغەمبەری ئیسلام ﷺ**: پێغەمبەری ئیسلامیش ئەگەر لە پێغەمبەرانی پێش خۆی زیاتر نەکەوتبێتە بەر ئازارو ناڕەحەتیو شاڵاوی پڕوپاگەندەی دوژمنانە ئەوا کەمتر نەبووە. قورئان باسی ئەو پڕوپاگەندە جۆراو جۆرانەمان بۆ دەکات کە دوژمنانی پێغەمبەرە ﷺ ئاراستەیان کردووە. بەجۆرەها شێوازی ناجوامێرانە لەهەوڵی ئەوەدا بوون کەسێتی خۆیو بانگەوازەکەی لەبەرچاوەی خەڵك ناشیرین بکەن و بەربەرەکانی بکەن و نەهێڵن بگاتە مێشك و دڵی خەڵکیو تەشەنە بکات. لێرەدا پێویست بەوە ناکات بەدرێژی باسی ئەو مەسەلەیە بکەین و تەنها *چەند ئاماژەیەکی کورت دەکەین چونکە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر بەدرێژی باسیان کردووە:*

١) **تۆمەتبارکردنی بەشێتی** (أم يقولون به جنة بل جاءهم بالحق وأكثرهم للحق كارهون).

واتە: یاخود دەڵێن جنۆکە دەستی لێوەشاندووەو شێت بووە. لەڕاستیدا مەسەلەکە وا نییە بەڵکو ئەو (هەق)ی لای خواوە بۆ هێناون و زۆربەی ئەوانیش چاوێن بەهەق هەڵنایە.

٢) درۆزنی (افترى على الله كذبا) سبأ/٨.

واتە: درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە.

٣) *درۆی بەشاعیردانانی* : (بل هو شاعر) الأنبیاء/
٤) *جادوگەری* (وعجبوا أن جاءهم منذر منهم وقال الكافرون هذا ساحر كذاب) ص/

ئەمەو چەندەها شێوازیتر کە دوژمنـــانی بانگـەوازی رزگـاریو هـەق و یەکسانی پێغەمبــەرانی خـوا بەگشتی و پێغەمبــەری ئیسلام بەتایبـەتی، پێغەمبەرانیان پێ تاوانبارکردووە. بەڵام .. دوارۆژ بۆ باوەڕی قوڵ و متمانەی بەهێزو هەق و هەقخوازییە. هەر بۆیـە دەبینـین لـە مێـژوودا هـەموو ئـەو پڕوپاگـەندەو چـاوڕاوو درۆو دەلەسـانە بەسـەر خاوەنـەکانیاندا شـکاوەتەوەو لەدەرکەوتنی حەقیقەتی تاوانبارانەیان نەپیاراستوون و فریایان نەکەوتووە.

## پەرەسەندنی چەمکی پڕوپاگەندە لە سەدەی بیستەمدا

دەسەڵات پەیداکردنی مەبدەئی نەتەوەکان لەسـەدەی نۆزدەداو ئـەوەی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـای لەسەربەسـتی تاکەکەسی پـەیوەندی نێـوان تـاک و دەوڵەتی کرد بە پەیوەندییەکی راستەوخۆ. وای لە پڕوپاگەندە کرد کە وەک دیاردەیەکی جەماوەریو هێزێکی سیاسی وەدەرکەوت.

• گۆڕانکارییەکانی سەدەی بیستەم هەر لە شۆڕشی کۆمۆنیستییەوە بگرە تا بەرپابوونی هەردوو جەنگە جیهانییەکەو ئەو پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرە زانستییەی لـەئامرازەکانی پـەیوەندیکردن بـە ئـەو زانسـتانەی لـەرەفتاری مرۆڤ دەکۆڵێتەوە بەخۆیەوە بینی. دەوری خـۆی هـەبوو لـە فۆرمەلـەبوونی واتای پڕوپاگەندەو دارشتنەوەی.

ئـەمڕۆ پڕوپاگـەندە چالاکییەکـە کـە لەلایــەن زۆربــەی دام و دەزگـا رەسمـیو ناڕەسمیـەکاندا بەشێوەی ئاشـکرا یــان شـاراوە بۆکـارتێکردن و کۆنترۆڵ کردن بەکاردەهێنرێ.

هیچ حکومـەت و حـیزب و تـاقمێکی چاکسـازی یـاخود بزوتنەوەیـەکی کۆمەڵایەتی یان دەستەیەکی ئابوری ناتوانێت بەبێ پڕوپاگــەندە کاربکـات و بەردەوام بێ.

*پڕوپاگـەندە لەسـەدەی بیسـتەمدا خاسـیەتەکانی دیـاریکراوە و سیمای تایبەتی خوی پەیداکردووە.*

*کەئەم خاسیەتانەش بریتین لە* :

یەکەم : پڕوپاگەندەی سیاسیو ناسیاسی لێک جیابوونەوە.

**دووەم** : پڕوپاگەندەی سیاسی شت پڕوپاگەندەی شەخسی نەماوە. بەڵکو رووە بەپڕوپگەندەیەکی جەماوەری نەتەوەیی گشتی کە لەنەریتەکانی کەلەپور سەرچاوە دەگرێ پشت بە فەرمانێکی ژیاری دەبەستێ.

**سێهەم** : پڕوپاگەندەی سیاسی وای لێ هاتووە کە هەمیشەو بەردەوامن بێت کاتێ ئامانجە بنەڕەتیەکەشی بەدی دێنێ بەردەوام دەبێ بۆ داکۆکی‌کردن لەم ئامانجەو بەهێزو فراوانکردنی.

**چوارەم** : بەڕوونی جیاوازی لەدەستپێکێ و ئامرازو رەگەزەکانیدا دەردەکەوێ کاتێ چوارچێوەکەی جیاواز بێ. پڕوپاگەندەی دەرەکی ناکرێ پشت بە هەمان دەستپێکێ و ئامراز و رەگەز ببەستێ کە پڕوپاگەندەی ناوخۆ پشتی پێ دەبەستێ.

**پێنجەم** : پڕوپاگەندە بووە بە کرۆکی بزوتنەوەی سیاسی بەڵکو پرۆسەکە درێژەپێدانی پرۆسەی پڕوپاگەندەکردنە.

**شەشەم** : هەروەکو جەنگ، لە هەردوو حاڵەتی شاڵاوبردن و بەرگری‌کردندا تەکنیکی تایبەتی خۆی هەیە.

## ئیسلام و جیاوازی‌کردن لەنێوان پڕوپاگەندەو بانگەوازدا

ئەزمونی سیاسی ئیسلامی لەسەرەتاکانی خۆیدا چەمکی (پڕوپاگەندە)ی بەگرێدراوی لەگەڵ چەمکی (بانگەواز)دا نەبێت نەناسیوە. وەک لێکدانەوەی دەقی ئەو نامەو پەیامانەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ فەرمانڕەوایانی دەوروپشتی دەوڵەتی یەکەمی ئیسلامی ناردوون و داوایان لێ‌دەکات بێنە ناو ئیسلامەوە. بەڵام پەرەسەندنی هاوچەرخەکان کارێکی‌کردووە جیاوازی لەنێوان چەمکە تێکچڕژاوەکان بکرێت، کە تێکەڵ بەچەمکی پڕوپاگەندەیی بوون لەوانەش بانگەواز.

بۆ جیاکردنەوەیان لەیەکتر زۆر بەکورتی دەڵێین: *پڕوپاگەندە بریتییەلە هەوڵێکی رێکخراوو نەخشە بۆ کێشراو بەمەبەستی دەست گرتن بەسەر رەوت و رای خەڵکیدا بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاری‌کراو لەرێی فشاری سۆزو ئائارامی فکرییەوە.*

لە کاتێکدا (بانگەواز) واتە ( *بڵاوکردنەوەی فکرەیەکی دیاری‌کراو بەمەبەستی ئەوەی کەسانی تر بڕوای پێبکەن بەبەکارهێنانی بەڵگەو بیرکردنەوەی زانستی دروست.*

*دەشێ ئەم فکرە ناوەرۆکێکی ئاینی، ئایدۆلۆژی یاخود سیاسی دیاری کراو بێت.*

*بەگشتی ئاراستەی باوەڕدار دەکرێت بۆ ئەوەی باوەڕەکەی قوڵتر بێتەوە).*

*دەتوانین لەسەر ئەم بناغەی خوارەوە چەمکی پڕوپاگەندەو بانگەواز لەیەکتری جیابکەینەوە:*

١) بانگەواز بەهایەکی (محوري) یاخود نمونەیی باڵای ئایدۆلۆژی‌یە کە لەبنەڕەتدا مورکێکی ئینسانی پێوەیە، حوکمی دەکات، لەکاتێکدا لۆجیکی پڕوپاگەندە لەبنەڕەتدا (مثالیة)یکی ئایدۆلۆژی‌و سیاسی‌و بەرژەوەندی حوکمی دەکات کە خۆی بەمەڵبەندێکی جوگرافی یاخود نەتەوەییەوە دەبەستێتەوە.

٢) بانگەواز بوونی پەیوەندییەکی روحی‌و (انتماء)یکی ئایدۆلۆژی دیاری‌کراو دەخوازێت. ئاراستەی مرۆڤێکی باوەڕدار دەکرێت یاخود ئامادەیی باوەڕهێنانی تیا بێت.

بەپێچەوانەی پڕوپاگەندەوە کە ئاراستەی یەکێ دەکرێت قەناعەتی هەبێت یاخود ئامادەبێت قەناعەت بکات. جیاوازیش لەنێوان قەناعەت کردن و باوەڕدا ئاشکرایە. باوەڕ بێتی‌یە لە (إنتماء)و وەلامدانەوەیەکی گشتی‌و هەمەلایەنە. بەلام قەناعەتکردن تەنها بریتی‌یە لە وەرگرتنی باری سەرنجێکی دیاری‌کراو.

٣) قەناعەت پێ‌کردن لە پڕوپاگەندەدا لە (جزئیات)ەوە دەست پێ دەکات و بە (کلیات) کۆتایی پێ‌دێت. بەپێچەوانەی بانگەوازەکە کە بە (کلیات) دەست پێ‌دەکات و بەوەرگرتنی (جزئیات) کۆتایی پێ‌دێت.

٤) پڕوپاگەندە هیچ پەیوەندییەکی روحی لەوەپێش یاخود (ولاء)یکی دیاری‌کراو، ناخوازێت لەکاتێکدا بانگەواز سۆزێکە راڤەی (ولاء) دەکات و دەیخوازێت.

٥) پڕوپاگەندە لەسەر بناغەی (ئارایشت و رازاندنەوە)و یاری‌کردن بەڕاستی بەندە، سڵ لە بەکارهێنانی درۆناکاتەوە. بەڵکو هەندێ‌جار هەر لەبنەڕەتەوە لەسەر درۆ دادەمەزرێت. لەکاتێکدا بانگەواز لەسەر راستگۆیی دادەمەزرێت و هەولی گەیشتن بەڕاستی دەدات.

٦) پڕوپاگەندە حالەتێکی هەڵچوون لە مرۆڤدا دروست دەکات هەروەک باسیشمان کرد سڵ لەبەکارهێنانی شێوازی بێ‌رەوشتانە ناکاتەوە.

لەکاتێکدا بانگەواز هەوڵدەدات (المنطـق الذاتـي) بدوێنێـت، هـەروەها هـەوڵی چەسپاندنی (ولاء) دەدات لـەڕێگای پابـەندبوونی بـە راسـتیو راشکاویەوە.

## رەگەزەکانی پڕوپاگەندەی هاوچەرخ

ئێستا وای لێهاتووە کە پڕوپاگەندە لەرژێم و کۆمەڵگا سیاسـیـیەکاندا تارادەیـەکی زۆر لەیـەک دەچـن ئەشـێ هـۆو ئامرازەکـانی جیـاوازبن، یـان لەرووی رێکخستنی و کاریگەریەوە جیاوازیان هەبێ. بەڵام ئەمـە کارناکاتـە سـەر گۆڕینـی سروشـتی دیـاردەی پڕوپاگـەندە کـە مـرۆڤ لـەجاران زۆرتـر دەکەوێتە ژێر کاریگەریەکەوەو وەلامی دەداتەوە.

ئـەو کەسـەی هەڵدەسـتێ بـە پڕوپاگـەندە دەرفـەت لـەوە دەهێنـێ کەخەڵکی جیاوازی لەنێوان راو راستیەکاندا ناکەن بۆیە بیروڕای خۆی وەکـو راستی بەخەڵک رادەگەیەنێ.

*ئەم پێشکەوتنەی بەسەر چـەمک و واتـای پڕوپاگـەندەدا هـاتووە کومـەڵێ رەگـەزی بەسـەر پڕوپاگـەندەدا سـەپاندووە کـەگرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن :*

**یەکەم** : شـالاوی پڕوپاگـەندە ئاراسـتەی جـەماوەردەکرێت ، پڕوپاگـەندەچی تاکی لا گرنگ نی یە وەکو تاکێ، بەڵکو پڕوپاگەندەی هاوچەرخ دەیەوێ بگا بە تاک بەو سیفەتەی ئەندامی جەماوەرە. لەسەر بناغەی کاروبارە هاوبەشەکانی کەلەنێوان تـاک و کەسـانی تردایـە. مامەڵـەی لەگـەڵدا دەکات. بەواتای مامەڵە لەگەڵ پاڵنەرو سۆزو هەسـت و نەستیدا یـان ئەو شتانەی باوەڕی پێیەتی، بەم جۆرە ئـەو کـارەی ئاراسـتەی دەکـرێ بەرهەمی دەبێ.

**دووەم** : پڕوپاگەندەی هاوچەرخ پێویستە گشتی بێ واتـا پێویسـتە تـاک لـە هـەموو لایـەکی فکـریو عاطفیـیـەوە ئابلوقـە درێ. ئەمـەش لـە پڕوپاگەندەچی دەخوازێ کە هەموو ئـەو هۆکارانـەی لەبەردەسـتیایەتی بەکاربێنێ.

بەجۆرێ هەر هۆیەو بەجۆرێ بگاتـە تـاک کـەوای لێ بکـات سـەر لـە نـوێو بەهەمان رووکار وەلامی پەیامـە پڕوپاگەندیـیـەکە بداتەوە.

سێهەم : پێویستە هیچ کەلەبەرێ بەجێ نەهێڵێو تیشوو درێژبی والە ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بێ.

پڕوپاگەندە وا لە تاک دەکات لەجیهانێکی دابڕاودا بژی. پێویستە سەرچاوەی دەرەکی نەبێ، هەروەها پێویست تەنها ساتێ بواری بیرکردنەوەی لەبەرامبەر پڕپاگەندەچییەوە پێنەدرێ. وەک ئەوەی لەکاتێکدا روودەدات کە پڕوپاگەندەکە بەردەوام نەبێ.

چوارەم : پڕوپاگەندە هەوڵ دەدا کۆنترۆڵی هەڵویست و را بکات تا لە کۆتاییدا کار لە رەفتار دەکات. بەجۆرێ کەئەم رەفتارە لەگەڵ ئەو هەڵویست و رایەدا سازگاربێ کە پڕوپاگەندەچی دەیەوێ دروستی بکات.

پێنجەم : شالاوی پڕوپاگەندەیی سەرکەوتوو پێویستە شت بە ناسینی باری دەروونی فەردو خاسیەتەکانی کۆمەڵەکەی بدات، پڕوپاگەندەچی وەکو عەسکەری وایە، دەبێ شارەزای ئەو زەویەبێ بەسەریدا دەڕوات، هەست و نەستیو رازو مەیل و رەوتەکانی ئەو جەماوەرە بزانێ کە دەیەوێ بیگاتێ، خالی دەست پێکردن بریتییە لە شیکردنەوەی خاسیەتەکانی کۆمەڵ و راو بونیادی سۆسیۆلۆژی.

بۆ تەواوکردنی ئەمەی پێشەوەو ناسینی شەپۆلە بنەڕەتیەکانی ئەو کۆمەڵەی کە پڕوپاگەندەی ئاراستە دەکرێت، بەمانای ناسینی ریسا سایکۆلۆجیە کۆمەڵایەتیە بنەڕەتەکان کە کۆمەڵگای لەسەر بنیات دەنرێت کارێکی پێویستە.

لەمەوە دەگەینە ئەو راستیەی کە هەرچەندە چەمکی پڕوپاگەندەیی لە رژێم و کۆمەڵگا سیاسییەکاندا لەیەک دەچن و پشت بەیەک شێوازی تەکنیکی دەبەستێ، بەڵام شەقلی پڕوپاگەندەو لۆجیکەکەی بەپێی جیاوازی تاقم و کۆمەڵگاکان جیاوازەو دەگۆڕێت.

## جۆرەکانی پڕوپاگەندە

*لەرووی سەرچاوەی پڕوپاگەندەوە دەکرێ بە سێ جۆرەوە:*

١- **پڕوپاگەندەی سپی :**

لەسەرچاوەیەکی رەسمیو ناسراوەوە دەردەچێو دەوڵەت بەرپرسیاریەتەکەی دەگرێتە ئەستۆ. ئەم جۆرە لە پروپاگەندە بۆ ئەوەی رێگای خۆی بکاتەوە هەوڵ دەدات پشت بە مەنطق و راستی و ژمێریاری ببەستێ تا قورسایی زیاتر بێ و کاری زۆر تر بێ.

٢- **پروپاگەندەی خۆڵەمێشی :**

سەرچاوەکەی زۆر روون نیەو گوێش ناداتێ ئەگەر خەڵکی سەرچاوە راستەقینەکەیان دۆزیەوە لەپاڵ ئامانجێکا خۆی دەشارێتەوەو رووداوەکان بەرەنگێ لێک دەداتەوە مەبەستەکانی خۆی بینێتە دی. بەناڕاستەوخۆ لەرێی دەرگایەکی نزیکەوە بلاودەبێتەوە.

٣- **پروپاگەندەی رەش :**

بریتیە لەو پروپاگەندەیەی کە سەرچاوەکەی ئاشکرا نیەو شاراوەیە. کەزیاتر لە رادیۆ نهێنیە ناراستەکراوەکاندا خۆی دەبینێتەوە. سا یاخود چاپکراوی بێناوونیشان یان بە ناوی خواستراوەوە لەرێی رێکخستنی نهێنیو سیخورو بەکرێگیراوانەوە بلاودەبێتەوە.

*لەرووی کات دیاریکردنیشەوە پروپاگەندە دەبێ بە دوو جۆرەوە :*

١- **پروپاگەندەی ستراتیژی :**

ئاراستەی هێزەکانی دوژمن و گەلەکەی و ئەو ناوچانەی کە داگیری کردوون، دەکرێت، کەهاورێکی نەخشەی ستراتیژی دەوڵەتە، بۆ هێنانەدی هەندێ ئامانج ئاراستە دەکرێ بەدرێژایی چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێ یان چەند ساڵێ. ستراتیژیەتی پروپاگەندەی دروست پشت دەبەستێ کە چوارچێوەی گشتی سیاسەت و ئەو بارودوخەی یارمەتی سەرکەوتنی دەدات یان رێی پێدەگرێت.

٢- **پروپاگەندەی تەکنیکی :**

ئاراستەی کۆمەڵێکی دیاریکراو لەماوەیەکی کورت دا دەکرێ بۆ بەهێزکردنی هەندێکاری سەربازی ناوخۆیی.

گیرگرفتی پروپاگەندەی تەکنیکی لە گونجاندنی هەڵوێست بە گوێرەی ئەو سنوورەی دەیسەپێنێ پەیدا دەبێت. پێویستە جەماوەری چاک و وەسیلەی چاک هەڵبژێردرێ بۆ ئەوەی کاریگەری خۆی هەبێت.

کاتێ راپۆرتێ بلاودەکرێتەوە پێویستە بوعدەکانی جەماوەر لەپێش چاو بگیرێ، با وادابینێین کە ئامانجی تەکنیکە خۆبەدەستەوەدانی زۆرترین

ژمارەی ئەفسەرو سەربازی دوژمنە. لەم کاتەدا پڕوپاگەندەچی لە رۆشنبیری دوژمن دەکۆڵێتەوەو ئایا شەرەفی عەسکەری نموونەیەکی بالایە؟

هەوڵ دەدا ئەوە بدۆزێتەوە ئایا بارێکی وا لەئارادایە کە دوژمن خۆبەدەستەوەدان بەشەرەف بزانێ؟ لەم حاڵەتەدا پڕوپاگەندەچی هەڵدەستێ بە بلاوکردنەوەی بەیانات.

لەمەبەدوا بەرگری هیچ مانایەکی عەسکەری نی‌یە ئەو گیروگرفتەی کە هەمیشە دێتە بەردەم پڕوپاگەندەچی تەکتیکی ئەوەیە تا چەند بەخۆیدا هەڵبلێ‌و هێرش بکاتە سەر دوژمن. *سێیەم جۆر دابەشکردنەکانی پڕوپاگەندە بریتی‌یە لە* **پڕوپاگەندەی ناوخۆیی‌و دەرەکی.**

وەک روونمان کردەوە ئامانجەکانی پڕوپاگەندە بریتی‌یە لە دروست کردنی هەڵوێست یان گۆڕینی بەو شێوەیەی پڕوپاگەندەچی‌یەکە مەبەستیەتی.

پڕوپاگەندە کاتێ رووی‌کردە کۆمەڵگای پڕوپاگەندەچی‌یەکە بە پڕوپاگەندەی ناوخۆیی ناودەبرێت. یاخود روو دەکاتە کۆمەڵگایەکی تری دەرەکی ئەو کاتەش پێی دەوترێت پڕوپاگەندەی دەرەکی.

بەم جۆرە روون بووەوە کە جیاوازی نێوان ئەم دوو جۆرە پڕوپاگەندە بریتی‌یە لە جیاوازی ئینتیمای نەتەوەی نێرەرو وەرگر ( المرسل والمستقبل ) ئەم جیاوازیەش کۆمەڵێ ئەنجامی لێدەکەوێتەوە:

یەکەم : زمانی پڕوپاگەندە لە پڕوپاگەندەی ناوخۆیی جیان لە زمانی پڕوپاگەندەی دەرەکی.

لەهی یەکەمدا زمانی نێرەرو وەرگر یەکێکە. بەلام لە دووەمدا جیاوازە.

دووەم : ئامرازەکانی پەیوەندی لە پڕوپاگەندەی ناوخۆدا ئاسانە چونکە لە ژینگە ناوخۆیی‌یەکەداو خودی کۆمەڵگا خۆجێی‌یەکە ( المجتمع المحلي ) هەڵقولاوە، بەلام ئامرازی پەیوەندی لە هی دووەمدا دەبێ تێودەوڵەتی بێ‌و بەربەستە نەتەوەیی‌یەکان رێی پێ‌نەگرن.

سێیەم: ئەو جەماوەرەی پڕوپاگەندەی دەرەکی وەردەگرێ جەماوەرێکی بیانی‌یە بەو مانایەی کە لە لۆجیک و هاوخاسیەتەکانیدا لەسەرچاوەی کارە پڕوپاگەندەیی‌یەکەوە جیاوازە.

چوارەم : لە پڕوپاگەندەی دەرەکی‌دا دەبێ پەیامەکە لەپاڵ لۆجیکی ئەمەوە لۆجیکی وەرگریش لەبەرچاو بگیرێ چونکە جاری وا هەیە ئالی، لەیەکتر دوورکەوتنەوە یان زۆرترە لە خاڵی لێکتر نزیکبوونەوە،

پێنجەم : کاری هەڵسەنگاندن بۆ زانینی ئەندازەی وەرگرتنی نامە پڕوپاگەندەیی‌یەکە لە هی دەرەکی‌دا نارەحەتە.
لەهەموو حاڵەتەکاندا پڕوپاگەندەی ناوخۆیی لەرژێمە شمولیەکاندا بێ یاخود دیموکراسی‌یەکان.
ئامرازێکە بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەلایەتی بەکاردێت، وەک ئامرازێکی یارمەتیدەر بەکاردەهێنرێ بۆ گەیشتن بە دەسەلات و کۆنترۆڵ گرتنە دەست و چەسپاندنی قەناعەتی خەڵکی بەرەوایی سیاسی تاقمی فەرمانڕەوا (یان ناشەرعی بوونی کاتێ پڕوپاگەندەکە لە کۆمەڵە نەیارەکانەوە دەردەچێ).
ئامانجی بنەڕەتی لە پڕوپاگەندەی ناوخۆیی بریتی‌یە لە کارکردن لەسەر دروست کردنی هاوکاری‌و بەیەکەوە بەستنەوە لە چوارچێوەی ڕێبازێکی دیاری‌کراو لەناو کۆمەڵ یان دەوڵەتدا وە دروست کردنی ( اتجاهات الرفض ) بەرامبەر دوژمن وەک کۆمەڵێکی دەرەکی کە مەترسی‌و هەڕەشە بۆ کۆمەڵگا پێک دەهێنێ.
بەلام پڕوپاگەندەی دەرەکی بریتی‌یە لەو هەوڵ و کۆششەی حکومەتێ دەیدات و ئاراستەی جەماوەرێکی بیانی دەکات بەمەبەستی گۆڕانکاری لە وەلامدانەوەی سەبارەت بەو کێشەیەی خراوەتە ڕوو پەیامی پڕوپاگەندەکە لەدەوری دەسوڕێتەوە.
واتە پڕوپاگەندەی دەرەکی لە زۆربەی کاتدا ملکەچی ویستی حکومەت دەبێ تەنانەت لەسایەی ڕژێمە دیموکراسیەکانیشدا و زمانی بەرژەوەندی روکەشی دەکات و لەگەڵ فەرمانی دبلۆماسی‌و سیاسی دەرەکیدا تێکەڵکیشە.

## ڕێسا بنەڕەتیەکانی پڕوپاگەندەی سیاسی

١- لەحاڵەتی هێرش بردندا ئامانجی کەسەکانە نەک بابەتەکان، وە کۆکردنەوەی هەموو تواناکان لە دژی ئەو شەخسانەی دەیەوێ گیروگرفتەکە سادە دەکات. چونکە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان شتێکی ئالۆزە.
٢- دەبێ شاراوە بێ تا دەرنەکەوێ کە پڕوپاگەندەیە ئەگینا تووشی شکست دەبێ.

٣- لەبەردەستابوونی زانیاری ورد دەربارەی کاروبارەکان و رووداوەکان بایەخێکی لە رادەبەدەری هەیە، ئەمە سەرەڕای ڕێکخستنی ئاڕاستە سیاسیو عەسکەرییەکان.

٤- پێویستە پڕوپاگەندە هەوڵدات وادەرنەکەوێ کەبابەتی نوێ بەدی دەهێنێ. بەڵکو پێویستە گرنگی بەو بابەتانە بدات کە هەن، وە بەجۆرێ چارەسەریان بکات کە خزمەت بە پڕوپاگەندەکە دەکات وەک ئەوەی لەقەیران و نەخۆشییەکانی رژێمی سەرمایەداری بکۆڵێتەوەو باس بکات، جا ئەم بابەتانە شێوازێکی هونەریو جۆربەجۆر چارەسەرکەر بکات.

٥- پێویستە پڕوپاگەندە قالبێکی نەگۆڕی وای نەبێ نەتوانێ لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی وزژدا بڕوا. هەمیشە ئامادەبێ کە بەجۆرێ چارەسەری بابەتەکان بکات کە لەگەڵ گۆڕانکارییە تازەکانی رۆژگاردا سازگاربێ.

٦- نابێ پڕوپاگەندە لەبەڕێوەبردنیدا ناوەند کۆنترۆڵی بکات. ئەگەر رێنومایی‌و ئامۆژرگارییەکان وەک باوە لای دەسەڵاتی ناوەندییەوە بێت کەسەرپەرشتی پڕوپاگەندە دەکات، پێویستە شێوازو وەسیلە بەجێبهێنرێ بۆ ئەو کەسانەی نەخشەی پڕوپاگەندەکە رادەپەڕێنن.

## رێساکانی نەخشەی شاڵاوی پڕوپاگەندەیی

لێکۆڵینەوە لەو کۆمەڵگایەی کە شاڵاوە پڕوپاگەندەییەکەی ئاراستە دەکرێ، لەهەموو لایەنەکانی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو دەروونییەوە.

کارێکی زۆر دەکاتە سەر ئامادەکردنی شاڵاوە پڕوپاگەندەییەکە. دیاریکردنی جۆری شاڵاوەکەو چۆنیەتەکەی لەسەر دەرەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوە وەستاوە.

### هۆکارەکانی سەرکەوتنی پڕوپاگەندەی سیاسی

١ لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجیەتی کۆمەڵایەتی (علم النفس الإجتماعي).

پێویستە لە رووی دەروونیەوە لەو رای گشتییە بکۆڵرێتەوە کە شاڵاوە پڕوپاگەندەکەی ئاراستە دەکرێ. پڕوپاگەندەچی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە

( لولا إذ سمعتموه قلتم مايكون لنا أن نتكلم بهذا سبحانك هذا بهتان عظيم) النور/١٦.

له فەرمووده‌یه‌كیشدا هاتووه: (من حسن الإسلام المرء تركه مالا يعنيه) رواه الترمذي.

واته: *له ڕەوشته بەرزەكانی مرۆڤی موسڵمان ئەوەیه كه واز لـه شتیٚ بێنیٚ پەیوەندی بەمەوه نیٚیەو سوودی نیه هەر لەخۆوه خۆ لەشت هەڵنەقورتێنیٚ.*

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كفى بالمرء كذبا إنما أن يحدث بكل ما سمع) رواه مسلم.

واته: *ئەوەنده تاوان بەسه بۆ مرۆڤ كه هەر شتێكی بیست بیگێڕێتەوه.*

هەروەها بوخاری دەیگێڕێتەوه كه پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووه له (وتی وتی) كه بریتی‌یه له وتنەوەی قسەیەك ساغ نەبووەتەوەو هێشتا ڕاستی‌و ناڕاستی وەدەرنەكەوتووەو بیٚسوودە.

٣- خوای گەوره هەڕەشەی سزایەكی سەخت لەو كەسانه دەكات یارمەتی بڵاوبوونەوەی شایعه دەدەن. (إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب أليم في الدنيا والآخرة والله يعلم وأنتم لا تعلمون) النور/١٩.

واته: *ئەوانەی دەیانەویٚ بەدكاری لەناو باوەڕداراندا بڵاوبێتەوه خوای گەوره له دنیاو دواڕۆژدا سزایەكی سەختیان دەدات. خوای گەوره دەزانیٚ‌و ئێوه نازانن.*

٤- ئیسلام تەنها فەرمانی بەوه نەكردووه كه شایعەكه بڵاونەكرێتەوەو نەوترێتەوه. بەڵكو داوادەكات هەڵوێستێكی ئیجابیشی لەبەرامبەر وەرگرین ئەمیش بە ڕەتدانەوەی تۆمەتەكەو ڕەواندنەوەی گومانەكەو ڕاست كردنەوەی بارەكه. فەرموودەیەكیش وێنەی ئەمەمان دەخاته ڕوو كه تیایدا هاتووه: (من رد عن عرض أخيه رد الله عن وجهه النار يوم القيامة) رواه الترمذي وحسنه.

واته: *هەركەسیٚ بەرگری له شەرەف و ئابڕووی براكەی یاخود خوشكەكەی بكات، خوای گەوره له ڕۆژی قیامەتدا لەئاگری دۆزەخ بەرگری لیٚدەكات.*

## چوارەم: بەرهەڵستی كرداری شایعه:

ئیسلام فەرمانی كردووه كه بەكردەوه بەرهەڵستی له شایعه بكرێت، لایەنه بەرپرسەكان هەڵسن بەم كاره. لەپاڵ ئەو بەیان و لێدوانانەی كه گومان لێكهەڵدەتەكێنیٚ‌و پەرده له ڕووی ناهەق هەڵدەماڵیٚ چەند

*شێوازێکی روون و ئاشکرای تری ئیسلامی بۆ رەتدانەوەی شایعە بە کردەوە هەیەو بەم جۆرەی خوارەوە :*

١) ئیسلام فەرمانی داوە بە پاککردنەوەی کۆمەڵگا لە شایعەچی‌یان سا بە دوورخستنەوەیان بێ یاخود زیندانی کردنیان.

٢) ئیسلام سزای بۆ ئەو جۆرە لە شایعە داناوە کە پەیوەندی بە شەرەفی موسڵمانانەوە هەیە ئەویش حەدی (قذف)ە.

لێرەداماوە پرسیارێ بکەین کە ئەویش ئەوەیە ئایا لە هیچ حاڵەتێکدا ئیسلام رێگا بەوە نادات شایعە وەک چەکێ بەکاربهێت.

لەراستیدا لەکاتی جەنگ دا لەبەرئەوەی جەنگ تاکتیک و فرۆفێڵە شایعەش وەک چەکێ لەبەرامبەر دوژمنی موسڵمانانەوە بەکاردێت. هەروەها بۆ ئامانجی بەرزو پیرۆزیش بەکاردێت.

## ئامرازەکانی جەنگی دەروونی

*بەشێوەیەکی گشتی ئامرازەکانی جەنگی دەروونی هۆیەکانی راگەیاندن لەخوارەوە بەکورتی ئاماژە بە ئامرازەکانی جەنگی دەروونی دەکەین.*

**یەکەم: رادیۆ** : رادیۆ رۆڵێکی گەورە دەبینێت لە کارکردنە سەر دوژمن و گوێزانەوەی هەواڵ و بیروراکان لەناو ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا، بەهۆی پێشکەوتنی رادیۆوە ئەمرۆ لە توانایدایە ملیۆنان مرۆڤ لە گۆشەو کەنارە جۆراوجۆرو دوورەکانی جیهاندا بدوێنێت. تایبەتی ئەو رادیۆانەی لەسەر شەپۆلی کورت ئاراستە دەکرێن.

ئەوەندە بەسە بزانین رادیۆی دەنگی ئەمریکا هەفتانە زیاتر لە (١٠٠٠) سەعات و بە (٤٢) زمان بەرنامەکانی خۆی پەخش و بلاودەکاتەوە. هەواڵ و دەنگ و باس و ناڵ و گۆرەکان لە دیدگای ئەمریکاو رۆژئاواوە بەجیهاندا بلاوبکاتەوە. رادیۆی مۆسکۆش هەفتەی (٢٢٠٠) سەعات و بە (٨١) زمانی جیهانی بەرنامە بلاودەکاتەوە. ئێستا لە جیهاندا زیاتر لە (٤٠) ئیزگە هەیە کە هەفتانە زیاتر لە (١٠٠٠) سەعات کاردەکەن و تایبەتن بە بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی مەسیحی.

ئیسرائیلیش (٥) ئیزگەی هەیەو لەسەر (١٥) شەپۆل و بە (١٦) زمانی جیهانی‌و هەفتەی زیاتر لە (٢٧٦) سەعات بەرنامە بلاودەکاتەوە.

بەرپرسە یابانیەکان دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم دانیان بەوەدا نا کە ئەو رادیۆ ئەمریکیەی لە (سان فرانسیسکۆ)وە پەخش دەکراو ئاراستەی ئەوان کرابوو، رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە خۆبەدەستەوەدانی یاباندا. سەرکەوتوویی رادیۆش بەندە بەراستیو دروستی وردەکاری ئەو هەواڵ و زانیاریانەی بلاوی دەکاتەوە هەروەها بەکارهێنانی باسی زمان و زانیاری بوون بە بارودۆخی کۆمەلایەتیو دەروونی ئەو ئامانجەی کە دەیدوێنێت.[1]

رادیۆ بەوە دەناسرێتەوە کە زۆر بەخێراییو بەسانایی پەیامەکەی دەگەیەنێت. بەهۆی رادیۆوە دەتوانرێت سوود لەو دەرفەتانە وەربگیرێت کە زوو بەسەر دەچن و نامێنن.

لە سیەکانی ئەم سەدەیەوە رادیۆ وەک چەکێکی ترسناکی جەنگی بەربلاوی سوودی لێوەردەگیرێت. سەرکردەکان هەر زوو کاریگەری ئەم ئامرازەیان هەست پێکرد. مۆسۆلینی فاشستی ئیتالیا لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئیزگەیەکی بەهێز کە لەسەر بناغەی ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەو ئەزمونێکی دەروونی بچێت بەرێوە، دەستەبەری ئەوە دەکات لە نیشتمانەکەمدا پشتم بپارێزێت. وە پێش ئەوەی سوپاکەم بجولێنم دوژمنەکەم بۆ تێک بشکێنێت).[2]

هیتلەری نازیش هەر لە بارەی رادیۆوە دەڵێت: (من دەزانم کاریگەری وشەی نوسراو لەسەر خەڵکی کەمترە لە هەندێ کە دەیبیسن. وە هەموو بزوتنەوەیەکی گەورەی سەر ئەم زەویە لەگەشەکردنی خۆیدا قەرزاری واندەرەکانە نەک نوسەرەکان).[3]

لەکاتی جەنگدا دەکرێ دووجۆر رادیۆ هەبێت:

١) **ئیزگە رەسمیەکان:** بریتییە لەو ئیزگانەی لەکاتی ئاشتیدا هەبوون. کاتی جەنگیش پەخشی ئاسایی خۆی درێژە پێدەدات. لەگەڵ بەکارهێنانی هەواڵ و (تعلیقات)و راگەیەنراوو بەیاننامەکان بەمەبەستی جەنگی دەروونی دژی دوژمنان. رادیۆی لەندەن دەورێکی گەورەی هەبوو لە رێکخستنی بەرهەڵستی دژی نازیزم لە سەرتاسەری ئەوروپاداو دوای ئەوەی ژمارەی گوێگرەکانی ئەو رادیۆیە لە (٢٠٠) ملیۆن کەس تێپەری کرد.

---

[1] التوحید ژمارە ٦٧/١٦٦٧.

[2] موسی زناد/ الحرب النفسیة، بغداد ١٩٩٤ ص٦٢.

[3] موسی زناد/ الحرب النفسیة، بغداد ١٩٩٤ ص٦٢.

٢) **ئێزگە نهێنیەکان**: تا پەیوەندی نێوان دوو دەوڵەت بەرەو لێڵی و ئاڵۆزتر بچێت. یاخود قەیرانێکی نێودەوڵەتی رووبدات ژمارەی ئێزگە نهێنیەکان زیاتر دەبێت. وە هەرکاتێ دەوڵەتێ ویستی شاڵاوێکی سەربازی یاخود سیاسی بکاتە سەر دەوڵەتێکیتر. بڕیاردەدات لەڕووی دەروونیەوە ڕێگای بۆ خۆش بکات. بەئاراستەکردنی ئێزگەی نهێنی یاخود هەندێ بەرنامەی تایبەت لەئێزگە بەکرێگیراوەکانەوە بۆ ئەوەی یەکەم جار متمانەی هاوڵاتیان بە حکومەتەکانیان نەهێڵێت و دواتر ئاراستەکردنی پڕوپاگەندەو دەست وەردانە کاروباری.

لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەشێوەیەکی بەرفراوان سوود لەم جۆرە رادیۆیە وەرگیرا. بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی گەلانی ئەوروپا ئەم جۆرە رادیۆیەیان کردبووە سەنگەرێکی گەورەی خەباتی دژی نازیەکان. ئەم رادیۆیانە هەوڵی ئەوەی دەدا هێزی سوپای بزووتنەوە رزگاریخوازەکان بەگەورە نیشان بدات و، ئەوەندە کاریگەربوون وای لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان کرد ئامادەی یارمەتیدانی ئەو بزوتنەوانە بن. دوای جەنگی کەنداوی دووەمیش هەندێ لەو رادیۆیانە ئاڕاستەی عێراق کران.

**دووەم: تەلەفزیۆن** : تەلەفزیۆن دەورێکی کرنگ دەگێڕێت. زۆرجار کاریگەرییەکەی دەکاتە ناو خاکی دوژمن و وڵاتانی دراوسێ. بایەخی تەلەفزیۆن لەوەدایە کە وێنەو دەنگ بەیەکەوە دەکوێزێتەوە. کە ئەمەش وای لێدەکات کاریگەریەکەی زۆرتربێت.

دەوڵەت دەتوانێ لەشاشەو تەلەفزیۆنەوە سەرکەوتنەکانی خۆی و شکستەکانی دوژمن بەجەماوەر نیشان بدات. هەروەک چۆن ئیسرائیل لەجەنگی حەوت رۆژەی (١٩٦٧)ی لەگەڵ عەرەبەکاندا سەعات بە سەعات لەتەلەفزیۆنی دۆستە رۆژئاواییەکانیەوە سەرکەوتنەکانی سوپاکەی و شکانی سوپا عەرەبیەکان بخاتە روو. تەلەفزیۆن لە بواری تێشکانی پایە رەوشتی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگیەکانی کۆمەڵگاو هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ناسنامەو روخاندنی پەیکەری رەوشتی و تێکدانی ساختمانی کۆمەلایەتی گەل و وڵاتێکیش بەتایبەتی لە چاخی کەناڵە فەزاییەکاندا دەتوانرێ سودێکی زۆری لێوەربگیرێت.

**سێهەم: سینەما**: ئەم ئامرازە زیاتر لە دەوڵەتە دۆست و بێلایەنەکاندا سوودی لێوەردەگرێت. هۆیەکی گرنگی دروستکردنی رای گشتییە. ئەمیش لەڕێی نیشاندانی فلیمە پڕوپاگەندە ئامێزەکانەوە.

ئەم جۆرە فلیمە ئەمریکیەکان لە میانەی جەنگی کۆریادا لەسەر ئاستێکی بەربلاو سوودیان لێوەرگرت. هەروەها لەلایەن نازیەکانیشەوە. زایۆنیەکان سودێکی زۆریان لە فلیمی سینەمایی وەرگرتووە بۆ بانگەشەی بیروباوەڕەکەیان.

زۆربەی ناوەندە بەرهەمهێنەرە گەورەکانی سینەمایی جیهان موڵکی ئەمانە، سینەمای زایۆنی کەوتە بڵاوکردنەوەی ئەو فلیمانەی باس لە مافی مێژووی جولەکەکان لە فەلەستین و چەوساندنەوەیان بەدەستی نازیەکان دەکات. بۆ ئەوەی سۆزی گەلان بەلای خۆیاندا رابکێشن و گەلی ئەڵمانیش تووشی گرێی تاوان بکەن. ئەمەش لێخۆشبوونی بەوە دەبێت کە هەرچی زیاتر پشتی قەوارەی زایۆنی بگرن و یارمەتی بدەن.

**چوارەم: رۆژنامە:** هەر لەدێر زەمانەوە دەورێکی گەورەی لە راگەیاندنی جەنگ و جەنگی دەروونیدا بینیوە. محمد علی پاشا لەکاتی هێرشەکەیدا بۆ سەر شام (٨٣ رۆژنامەی سەربازی) بەسەر ئەفسەرەکانی سوپادا دابەش دەکراو پێدەچێت بۆ سەربازەکانیش خوێندرابێتەوەو لێکدرابێتەوە. تورکەکان جگە لە رۆژنامە لەکاتی جەنگدا. نامەی مۆرکراویان بەبازاڕدا بڵاودەکردەوە کە هەواڵە بەپەلەکانی جەنگی تێدا بڵاودەکرایەوەو کاری زۆر لەخەڵک دەکرد. لەجەنگی جیهانی دووەمیشدا رۆژنامە سودێکی زۆری لێوەرگیرا.

نەمساوییەکان بەهۆی هەواڵێکەوە کە لە رۆژنامەدا بڵاویان کردەوەو لەرێی دەزگا هەواڵگرەکان و سیخوڕەکانیانەوە دەستیان کەوتبووتوانیان سوپای ئیتالی بەرەو (کروبرتیو) تووشی شکست بکەن. هەواڵەکەش پێکدادانی نێوان پۆلیس و خەڵکی لەهەندێ شاری ئیتالیادا دەکرد کە لەسەر خۆراک روویداوە. نەمساوییەکان ئەم هەواڵەیان قۆستەوەو هەڵسان بە ئامادەکردنی نوسخەی رۆژنامەی هاوچەشنی رۆژنامە ئیتالیەکان لەقەوارەو ژمارەی لاپەڕەو جۆری پیت و شێوازو ناوی پەیامنێرو (ئیعلانات)دا. تەنها ئەم هەواڵەیان لێ زیاد کردو بە پاڵپشتی باسکردنی ناوی کوژراوو بریندارەکان لەهەموو شارێکی هەرێمەکەدا. دوای ئەوە هەزاران نوسخەیان لێ چاپ کردو لە ئاسمانەوە بەسەر سەنگەری ئیتالیەکاندا فڕێیان دایە خوارەوە. دوای کەوتنەخوارەوەو خوێندنەوەی لەلایەن سەربازە ئیتالیەکانەوە لەرزەیان پێکەوت و ناڕەزایی و بێزاری لەناویاندا بڵاوبۆوە. بەم جۆرە ورەیان کەم بۆوەو بەرەو دواوە هەڵدەهاتن و

خۆیان دەدزیەوەو بەرەی شەڕیان لاواز بوو. نەمساوییەکان کە بەمەیان زانی هێزەکانیان بەشەو نارده بەرەکەو زۆر بەئاسانی گرتیان و بەمەش سوپای ئیتالی نیو ملیۆن سەربازی لەنێوان کوژراوو بریندارو بێسەرو شوێن لەدەست دا. زایۆنیەکان سودێکی زۆریان لەرۆژنامە وەرگرتووەو چەندان رۆژنامەی بەناوبانگی دنیا راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەلایەن ئەمانەوە دەردەچێت و خزمەتی مەسەلەکەیانی پێدەکەن و کار لە رای گشتیی جیهانیی دەکەن.

لەکاتی جەنگدا رۆژنامە چ جەنگی بێ یاخود ئاسایی هەوڵئەدات هەواڵی بەرەی ناوخۆو بەرەکانی جەنگ بە سەربازان و جەماوەر بگەیەنێت بۆ ئەوەی هەواڵ و دەنگ و باس و پڕوپاگەندەی دوژمن کاریان تێنەکات هەروەها لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر لەسەر مێژووی جەنگە نەتەوەییەکان بڵاودەکاتەوەو هانی گیانی قوربانیدان و پاڵەوانێتیو فیداکاری دەدات. هەروەها چاوپێکەوتن لەگەڵ جەنگاوەران ساز دەکرێت و ریپۆرتاژی وێنەدار دەربارەی رەوتی شەڕەکان لەبەرەکاندا چاپ و بڵاودەکاتەوە. هەوڵی زیندووکردنەوەی یادەوەریو سەروەریەکانی مێژوو دەدات. لەڕێی وتاری جۆراوجۆرەوە جەنگێکی دەروونی دژی دوژمن بەرپا دەکات. ئەگەر رۆژنامەگەری بەدەسەلاتی چوارەم ناوبرابێت ئەو دەورە گەورەی دەیگێڕێت لەئاراستەکردنی رای گشتیدا بزانین ئیتر ئەوسا هەست بەوە دەکەین بەکارهێنانی وەک ئامرازێکی جەنگی دەروونی چ شوێنەوارێکی هەیە.

**پێنجەم: بڵاوکراوە (المنشورات):** ئامادەکردنی بڵاوکراوە جۆراوجۆرەکان، پێویستی بە زانیاری هەیە دەربارەی هەڵوێستی (سیاسیو سەربازیو ئابوری) دوژمن. لەم بڵاوکراوانەدا ئەو هەواڵانە بڵاودەکرێتەوە کە دوژمن رێگە نادات لەناو وڵاتەکەیدا بڵاوببێتەوە. لەو بڵاوکراوانەی لەبەرەکاندا بڵاودەکرێتەوە دەبێ ئەو سەربازانەی دەیانەوێ خۆ بەدەن بەدەستەوە دڵنیا بکرێنەوە کە رێزیان لێدەگیرێت. هەروەها زانیاری دەربارەی ئەو پەیماننامەو رێکخراوە نێودەوڵەتیانەش بڵاودەکرێتەوە کە دیلەکانی شەڕ دەتوانن لەڕێی ئەوانەوە نامە بۆ کەس و کاریان بنوسن و ئاگایان لێیان بێت. بەکورتی *بڵاوکراوەکان وەک هۆیەکی پڕوپاگەندەو شایعەکردن دژی دوژمن دەکرێت بەم جۆرانەی لای خوارەوە:*

١) ئەو بڵاوکراوانەی داوای خۆبەدەستەوەدان دەکەن. لەسەر بەرەکانی جەنگ یاخود شارەکان بڵاودەکرێتەوە. هەواڵ و دەنگ وباسی شەڕی

لەخۆگرتووە. هەروەها هەڵویستی بەرەکان و پەرەسەندنەکانی شەڕو هەڵویستی سیاسی بۆ شارنشینەکان شی‌دەکاتەوە بۆ لێکهەڵوەشاندنەوەی بەرەی ناوخۆی دوژمن. مەرجە لەو کاتانەدا بڵاوبکرێتەوە کە ورەی دوژمن دابەزیوەو بڵاوکراوەکەش شتی زۆر تازەی تیا بێت. هەروەها ئاراستەکردنی تیا بێت دەربارەی چۆنیەتی خۆبەدەستەوەدان و زانیاری دەربارەی جۆری ئەو مامەڵەی دوای خۆبەدەستەوەدان لەگەڵی دەکرێت، تیا بێت. دەبێت رەنگەکانی زۆر سەرنج راکێش بن. ئەم بڵاوکراوانە دەوری گەورەیان لە شکست پێهێنانی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بینی. کاتێ بەفڕۆکە (١٤) مەرجەکانی ولسون سەرۆک کۆماری ئەو کاتەی ئەمریکا بەسەر شارەکانی ئەڵمانیادا خرانە خوارەوە.

دەبێ ئەم بڵاوکراوانە لەکاتی گونجاوی خۆیدا بەکاربێت ئەگینا سودی وای نابێت.

٢) کارتی رێپێدانی تێپەڕین: ئەم جۆرە بڵاوکراوە لەگەڵ ئەو بڵاوکراوانە فڕێ دەدرێن کەداوای خۆبەدەستەوەدان دەکات. لەکاتی خۆبەدەستەوەدان سەربازی دوژمن دەریدەهێنێت بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بگاتە بەرەکانی‌دواوەی جەنگ.

٣) بڵاوکراوە هەواڵیەکان: جاری وا هەیە رێدەکەوێت هەواڵێک بایەخێکی ناوخۆیی زۆری دەبێت و دەخوازێت رێو شوێنێکی تایبەتی لەبەرامبەرەوە وەربگیرێت. بڵاوکردنەوەی هەواڵی لەم چەشنە بەخێراییو پێش ئەوەی دوژمن بەرژێتە سەر ئەوەی رێو شوێنی پێویست بگرێتە بەر دەیخاتە هەڵویستێکی واوە بەدرۆخستنەوەی کارێکی ئاسان نەبێت.

٤) بڵاوکراوە وێنەدارەکان: ئامانج لەم جۆرە بڵاوکراوانە وروژاندنی سۆزو رەمەکە شاراوەو خەفەکراوەکانە. لەجەنگی کۆریادا سوود لم جۆرە بڵاوکراوانە وەرگیرا کۆریەکانی باکور لەمانگی کۆتایی ساڵدا بڵاوکراوەیەکیان بەسەر سەربازە ئەمریکیەکاندا خستە خوارەوە وێنەی کۆمەڵێ سەربازی ئەمریکیو هاوسەرو دۆست و منداڵەکانیانی تیا وێنەکرابوون کە بەدڵخۆشی‌یەوە لە دەوری درەختی لەدایک بوون کۆبوونەوە. لەژێر وێنەکەدا نووسرابوو (بۆچی تۆ لە کۆریا سەرماو سۆڵەو پەستیو خەمناکی دەنۆشی!! ئەو پەیوەندییانەی لەناو نیشتمانەکەتدا هەتن نکولیان لێناکرێت، بگەڕێرەوە بۆ نیشتمانەکەت و کۆریا واز لێبێنە بۆ کۆریەکان).

٥) بڵاوکراوەی هەڵوێستێکی تایبەت: ئەکرێ هەندێ دەرفەت و هەڵوێست بقۆزرێتەوە کەبەخێرایی تێدەپەڕێت. ئەمەش لەڕێی دەرکردنی کۆمەڵێ بڵاوکراوەو روخانی دوژمن بقۆزرێتەوە. تا دوژمن وابزانێ تازەترین زانیاریان دەربارەی لایە. کە ترس و لەرزو پەریشانیو دڵەڕاوکێیەکی زۆری بۆ دروست دەکات.

## جۆرەکانی جەنگی دەروونی

*جۆرەکانی جەنگی دەروونی بەگوێرەی جیاوازی باری سەرنج و بۆچوونی شوێن و کات دەگۆڕێت. سەبارەت بە دابەشکردنی لەسەربناغەی کات و شوێن دەکرێت بەم جۆرانەی لای خوارەوە*

**یەکەم : جەنگی دەروونی ستراتیژی** : جەنگێکی هەمەلایەنەیەو ئامانجە دوورەکانی دەوڵەت بەرجەستەتە دەکات و دام و دەزگا جۆراوجۆرەکانی بەشداری تێدا دەکەن. لەڕووی کات و شوێنەوە مەودایەکی بەرین و دوورودرێژ دەگرێتەوە. مەرج نیە وشێنەوارەکەی بەزویی دەربکەوێت. بۆ نموونە وەک هەوڵدان بۆ چەسپاندنی سیستمێکی جیهانی جاری وا هەیە کیشوەرێک یاخود سەراپای جیهان دەگرێتەوە. کەواتە جاری وا هەیە دەیان ساڵ کاری بۆ دەکرێت. بەڵکو دەشێ سەدان ساڵ کاری بۆ بکرێت وەک ئەو جەنگە دەروونیەی سەدان ساڵە رۆژئاوا لەدژی رۆژهەڵاتی ئیسلامیی هەڵیگیرساندووەو دەیەوێت ناسنامەی نەهێڵێت و تووشی گرێی خۆبەکەم زانین و چۆکدادانی بکات.هەروەها هەوڵەکانی زایۆنیەکان بۆ گەڕانەوە بۆ خاکی فەلەستین لەم جۆرە بوو. لەم شێوە جەنگەدا ئامانجەکان بە روونی دیاری دەکرێت و بەردەوام کاریان لەسەر دەکرێت تا بەدیهێنانیان.

بەڵام تاقیکردنەوەکانی مێژوو ئەوەیان سەلماندووە کە دیاریکردنی ئامانج و بەدیهێنانی بەتەنها لەڕێی هێزەوە بەس نیە بۆ ئەوەی بتوانرێ پارێزگاری لێبکرێت و بهێڵرێتەوە. بەڵکو ئەوە لەخودی خۆیدا ئەگەر مەسەلەکە هەق نەبوو، گەورەترین هۆکاری لەدەست چوونی ئامانجەکەو هەرەسهێنانیەتی.

ئەمریکا بە هەموو هێزی سەربازی خۆیەوە نەیتوانی چۆک بە ڤێتنامیەکان دابدات. بەهەمان شێوەش رووسەکان بەرامبەر گەلی ئەفغانیو لەم دواییەشدا گەلی شیشانی قارەمان. هەوڵە درێژخایەنەکانی رۆژئاواش

لەباتی ئەوەی ئیسلام لەشانۆی ئایدۆلۆژیو سیاسیو کۆمەلایەتی جیهانی ئیسلامی بکاتە دەرەوە دەبینین سەرەرای هەموو دواکەوتوویی‌و بارکەوتوویەک ئەمرۆ راپەرینێ سەراپای جیهانی ئیسلامیی گرتۆتەوە.

سەردەم ئەو هەولە رەگەزپەرستانەو پەیرەوکردنی سیاسەتی جینۆسایدو قرکردن و سرینەوەی ناسنامەی قەوارەو بوونی کوردیش کە لەلایەن نەیارانی کوردەوە پەیرەوی لیکراوە، نەیتوانیوە دەنگی زولالی حەقخوازانەی ئەم گەلە زۆرلیکراوە کپ بکات.

چونکە سەرجەم ئەو تاوانە ناهەقیەکی گەورەبوون دەرهەق بە کورد ئەنجام دراون.

ئەو جەنگە دەروونیەی کەئاراستەی قەلەمرەوەکانی ژێردەسەلاتی دوژمنیش دەکرێت بەمەبەستی ورە پێبەردان و خۆبەدەستەوەدانی. هەر بە ستراتیژی ناودەبرێت کە سەرکردایەتی سیاسی بەرپای دەکات و هەولدەدات شکست و بەزینە سەربازییەکانی بەرەکانی جەنگ و لێنەهاتوویی سەرکردایەتی دوژمن و بەدەرخستنی ناکۆکیەکان و ئاشکراکردن و باسکردنی باری خراپی ئابووریو داراییو کەم توانایی لەپێشکەشکردنی کەرەسەی خۆراکیو نیشاندانی ئەو تەنگژانەی لەمانەوە پەیدابوون، بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی چۆکی پێدابدات.

**دووەم: جەنگی دەروونی تەکتیکی:** لەکاتی شەرداو هەندێجاریش هەندێ پێش و پاشی شەر لەدژی هێزەکانی دوژمن بەکاردەهێنرێت.

ئەمەش بە لاوازکردنی ورەی کەرتەکانی سوپاکەیو سەرەنجام ناچارکردنی بە پاشەکشەکردن و هاندانی بۆ خۆبەدەستەوەدان. هەروەها بریتییە لە لێکدانی راستەوخۆ لەگەل دوژمنداو تێکهەلچوونی دەستەویەخە. جا لەرێی جەنگی سیاسیو سەربازیو ئابووریەوە بێت یاخود هەموویان بەسەریەکەوە.

ئامانج لە جەنگی دەروونی تاکتیکدا بریتییەلە کۆتایی هێنانی ململانێو یەکلاییکردنەوەی جەنگ و بردنی دوژمن بەرەو حالەتی درەوون بەزین. سەرەنجام خۆبەدەستەوەدانیو ملکەچ کردنی بۆ مەرج و ویستی لایەنی براوەو سەرکەوتوو. بەلام پێویستە لێرەدا ئەوە بوترێت کە تێکشکاندنی دوژمن لەم جۆرە جەنگەدا مەرج نیە ببێتە هۆی ریشەکێشکردنی هێزو تواناکانی دوژمن و توانای سەربەرزکردنەوەی نەمێنێ.

لەجەنگی جیهانیی دووەمدا روسەکان هەرچەندە چەندەها شکستی سەربازیان بەسەرداهات، بەلام لە رووی دەروونییەوە نەڕووخان. سەرکەوتنیش بەندە بەوورەی بەرزو دەروونی بەهێزو بڕیاری خۆبەدەستەوەنەدانی لایەنێ لەلایەنە شەڕکەرەکان.

**سێهەم: جەنگی دەروونی پشتگیری (الحرب النفسیه التعزیزیه):** بە پلەی یەکەم ئاراستەی مەدەنیەکانی پشت بەرەکانیجەنگی دوژمنەوە دەکرێت. بریتییە لە چەسپاندن و قوڵکردنەوەی ئەو سەرکەوتنانەی کە جەنگی ستراتیژیو تاکتیکی بەدەستیان هێناوە. هەروەها هەوڵدان بۆ ئەوەی ئەو سەرکەوتنانە ببێتە ئەمری واقع و بەردەوام بێت و خەڵک بەرەوای ببینێت. ئەم جۆرە دەنگە پشت دەبەستێت بە جۆرێک لە ترساندن و بەهیواکردن لەهەمان کاتدا. بۆئەوەی دوژمنی رووخاو حاڵی کات و تێی بگەیەنێت کە شکستەکانی هەتا هەتاییە. ئەگەر لەدوارۆژدا خوازیاری ژیان و ئاسایشە ئەوا پەیوەستە بە رازیبوونیئەم تیشکشکانەو هاوکاری کردنی لەگەڵ لایەنی سەرکەوتوودا.

## خاسیەتەکانی جەنگی دەروونی

*جەنگی دەروونی چەند خاسیەتێکی هەیەو لەخوارەوە بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین:*

**یەکەم :** بریتییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵویست دا.

**دووەم:** بریتییە لە جەنگ، کەواتە فریودان و فڕوفێڵ بڕبڕەی پشتیەتی. هەروەها پێویستە نەخشەکەی بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەش کرابێت. هەر قۆناغەش ڕێگا خۆشکەری قۆناغەکای تر بێت، دەبێت یەک سەرکردایەتی هەبێت. یەکێ لە رەگەزەکانی نەخشەکەش دەبێ بریتی بێت لە شێوازی پاشەکشێ. چونکە دەبێت ئەگەری شکست خواردن لەبەرچاو بگیرێت.

**سێهەم:** مامەڵەکردنێکی دەروونی راستەوخۆ نییە. بەڵکو پەنا بەهەموو هۆکارێکی ماددی دەبات کە بەئامانجی دیاریکراوی دەگەیەنێت. بلاوکردنەوەی شایعە پشێویو ئاژاوە نانەوە، نائارامی خوڵقاندن، بلاوکردنەوەی ماددە سڕکەرەکان، ترۆری سەرکردەکان و هەر هۆیەکی تریش کەلەدەستی بێت و بتوانێت بەکاری بێنێت سڵی لێناکاتەوە.

**چوارەم:** لەجەنگی دەروونیدا بە ئاسانی دەتوانرێت شێوازی نوێ بدۆزرێتەوە بۆ دەست گرتن بەسەر ( منطق )ی مرۆڤایەتیدا. کە گەیشتۆتە پلەیەکی پێشکەوتوی وا دەکرێت ئاراستەی سەرجەم کۆمەڵگا یان بەلایەنی کەمەوە ئاراستەی رابەرو سەرکردەکانی بکرێت.

**پێنجەم** : جەنگی دەروونی پەیوەندی ناوەکیو دەرەکییەکان بەیەکەوە کۆدەکاتەوە: ئاراستەی دوژمن دەکرێت. خۆ ئەگەر تێکشکا دەگەڕێتەوەبۆ خودی ئەو کەسەی پێی هەڵساوەو دەبێت بە پەیوەندییەکی ناوەکی.

## قۆناغەکانی جەنگی دەروونی

جەنگی درەوونی بە گوێرەی هەندێ بیروڕای پسپۆڕانی بوارەکە دەکرێت بەم جۆرانەی لای خوارەوە:

**قۆناغی یەکەم : سەرلێشێواندن و بیروڕا پەشۆکاوی :**

مەبەست لەمە بەدیهێنانی حالەتێکی پەشێوی دوودڵیە لە کۆمەڵگای سیاسیدا. یاخود رۆشن نەبوونی رای گشتییە. ئەوەی لەم قۆناغەدا دەوری ترسناک دەبینێت بریتییە لە:

ا) شایعە ، ب)ئەو کتێبانەی بەمەبەستی خراپ دەنوسرێن.

ج) دزە پێکردنی بلاوکراوەو کاسێت و فلیمی ڤیدیۆ.

**قۆناغی دووەم: تێکدانی ئاسایش:** مەبەست لەمەش نەهێشتنی متمانەیە بە دەسەلاتداران. تێکدانی ئاسایش واتە هاوولاتی ئیعر ناتوانێت بۆ پاراستنی خۆی پشت بە دەسەلاتی دەوڵەت ببەستێ. *لەم قۆناغەشدا ئامرازەکان جۆراوجۆرو هەمەچەشنن:*

ا) ئاشوب نانەوە. ب)گەورەکردنی رووداوە ئاساییەکان. ج)کوشتنی رێبەرو سەرکردە بەرپرسەکان. د)دروستکردنی تۆمەتی خیانەت و هەوڵدان بۆ ناشیرن کردنی سەرکردایەتیە دڵسۆزو مێژووییەکان.

**قۆناغی سێهەم: توکمە نەبوون و یەکنەگرتنی جەستەی نەتەوەیی**

ئەمەش واتە پچڕاندنی دەمارەکانی ئەم جەستەیەو کۆڵەوارکردن و یەکخستنی بەجۆرێک کە توانای بەرهەڵستیکردنی نەمێنێت و *نیشانەو ئامرازەکانی ئەمیش جۆراوجۆرن:*

١) سیخوڕیو تابوری پێنجەم. ٢) ناوەندەکانی توێژینەوە، کە دەورێکی گومان لێکراو دەگێڕن. بەڵام لەژێر پەردەی زانست و سەربەستی لێکدانەوەی زانستیدا.
٣)فیستیڤاڵ و کۆڕو ئاهەنگی لاوان کە هەندێ بیروڕای تیا بلاودەکرێتەوەو هەندێ تاقم و دەستەش تووشی ژەهراوی بوونی فکریو سیاسی دەکرێن.
٤) دزەکردنە ناو دەزگاکانی موخابەرات بەجۆرێک کە بەدەستی ئەنقەست فەرمان دەردەکرێت بە بلاونەکردنەوەی هەندێ زانیاری، یاخود دزەپێکردنی بەشێوازێکی دیاریکراو.
٥) بلاوکردنەوەی نامرازەکانی تێکدانی ناوخۆیی.

**قۆناغی چوارەم : قۆناغی لێه هەلوەشاندنی یەکیەتی نیشتمانی**

کە بریتییە لەهەلوەشاندنەوەی یەکیەتی نیشتمانیو تۆکمەیی نەتەوەیی. کە بەتەواوبوونی ئەم ئامانجەکانی جەنگی دەروونیش کۆتاییان پێدێت. بەجۆرێک هاوولاتی بڕوای بە خودی نەتەوایەتیەکەشی نامێنێت.
ئامرازەکانی ئەم قۆناغەش زۆرو جۆراوجۆرن لەوانەش:
١) بانگەوازی ئایدۆلۆژیو برەوپێدانی ئایدۆلۆژییە جیاوازەکان، بەلکو هاندانی جەنگی ئایدۆلۆژی.
٢) جەنگی زانیاری.
٣) کردارەکانی شۆردنەوەی مێشک.
٤) ناشیرین کردن و شێواندنی سیمای نەتەوایەتی.
٥) دووبارەکردنەوەی مێژوو بۆ شێواندنی دەستکەوتەکان.
٦) بەدیهێنانی باری ترس و لەرزی گشتی.

## ئامانجەکانی جەنگی دەروونی

ئامانجەکانی جەنگی دەروونی لەروویەکەوە، سیاسیو ئایدۆلۆژین و، لەروویەکی ترەوە سەربازیو مەیدانین. جەنگی دەروونی دەیەوێت، کار لە رەفتاری ئەوانە بکات کە ئاراستەیان دەکرێت. بۆ دروستکردنی حالەتێک لە ترس و لەرزو وروژاندنی هەستی دوژمنکارانەی لای هاوولاتیان. نانەوەی

پشێوی لـه سـەربازگەی دوژمنـدا بـۆ کارکردنـه سـەر (الضبـاط)ی تاکـەکان و بڕیاری فەرماندەو سەرکردەکان لە بواری جەنگ دا.

پڕۆفیسۆر (ریتشارد کروستمان) لێپرسراوی بەشـی جـەنگی دەروونـی لەبەریتانیادا دەڵێت: (ئامانجی ئەم جەنگە تێکشکاندنی رەوشتی دوژمن و پەشۆکاندنی دیدە سیاسی‌یەکەیەتی، هەروەها لە گۆڕانی هەموو ئەو بـەهاو بیروباوەڕانەی کە باوەڕی پێیەتی. لەجێگای ئەو وانەی تازەی پێ‌بدرێـت. بـۆ ئەوەی بگاتە ئەو حاڵەتەی ئێمـە باوەڕمـان بـە چیـە ئـەویش بـاوەڕی پـەوە بێت).

*بەگشتی دەتوانین ئامانجەکانی جەنگی دەروونی لـەم خاڵانـەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:*

١) *نەهێشتنی بڕوای دوژمن بە سەرکردایەتی‌و چەك و جبەخانەکەی.*

٢) *دروستکردنی بـارێکی شـڵەژاو لای دوژمـن*، تـا بگاتـە ئـەو بڕوایـەی ئامانجـەکانی لەجـەنگدا ناڕاسـتن و دوودڵ کردنـی لـەوەی توانـای ئـەوەی هەبێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

٣) *زیادکردنی ناکۆکی لـەنێوان حکومـەتی دوژمـن و گەلەکـەیدا*، ئـەمـەش لەرێگای هـاندان و پـەرەپێدانی بزوتنـەوە بەرهەڵسـتکارەکانی ژێـر سـایەی دەسەڵاتی.

٤) دووبەرەکی نانـەوە لـەنێوان دوژمـن و هاوپـەیمانـەکانیداو بێ‌بەشـکردنی لەهەر هاریکاریەکی سیاسی‌و ئابووری لەگەڵیاندا. دەکرێت بۆئـەم مەبەسـتە سـوود لەهەسـتی تایەفەگـەری‌و نـەژادی‌و نەتەوایـەتی‌و ناوچەگـەرێتی وەربگیرێت یاخود گەورەکردنی لەڕادەبەدەری رووداوێك. چیرۆکی یـەکێ لـە هاوولاتیـان بـەناوی (نـەعیمی کـوڕی مەسـعود) لـە هەڵوەشـاندنەوەی هاوپەیمانیەتی نێوان قوڕەیش و هێزە شالاوهێنەرەکان لەجەنگی (احزاب)دا لەگەڵ ئابوری پێنجەمی نـاو مەدینـە کـە جولەکـەکانی (بني قريظة) پێکیـان دەهێنا. نموونەی هەوڵێکی سەرکەوتووی ئەم بوارەیە.

٥) *بـەهێزکردنی دۆستایەتی‌و هاریکاری لەگـەڵ هـێزە هاوپەیمانـەکانداو* دروستکردنی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ لایەنە بێ‌لایەنـەکان و دۆسـتەکانداو بەدەستهێنانی پشتیوانی و پشتگیری دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکان.

٦) *کەرت و پەرت کردنی ریزەکانی دوژمن و نانەوەی دووبـەرەکی‌و* نـاکۆکی لەناویدا لەم رووەوە جەنگی دەروونی جەخت لەسەر هەندێ بیروڕا دەکـات و سوودیان لێ‌وەردەگرێت وەك هەوڵدان بۆ دروسـتکردنی نـاکۆکی چینایـەتی‌و

وروژاندنی هەستی رەگەزپەرستیو خێلایەتیو تێکدانی پەیوەندی نێوان پارتە سیاسیەکان و ڕێکخراوە جەماوەریەکان ...... هتد. ئەمەش دیارە بەمەبەستی لاوازکردنی بەرەی ناوخۆ هاتنەخوارەوەی توانا بەرگرییەکانی.

٧) *قەناعەت کردن بە هێزەکانی دوژمن کە ئەو ئامانجانەی لەجەنگدا هەولی بۆ دەدەین راست و رەوان و هەقی خۆمانە بۆیان بجەنگین.* هەولدان بۆ ئەوەی تاکەکانی دوژمن هاوسۆزی لەگەڵ ئەم ئامانجانەدا پەیدابکەن.

٨) *هەولدان بۆ سڕینەوەی هوشیاریو ئاگایی لەڕێی دوویات کردنەوەوە.*

٩) *شکست پێهێنانی دوژمن و بەدیهێنانی بارێکی شلەژاوی دەروونی لەلای،* چاندنی تۆوی رەشبینیو نائومێدی لەدڵ و دەروونی هێزەکانیداو باوەڕنەهێشتنیان بە بنەماو ئامانجەکانی. هەروەها لەڕووهەڵمالینی شێوازی دوژمن و هەولدان بۆ لەق کردنی پایەکانی رژێمەکەی وەک پێشەکیەک بۆ رووخاندنی.

١٠) *کارکردنە سەر هەڵوێست و ئامانج و رەفتاری جەماوەر.*

١١) *شۆردنەوەی مێشکی بەرامبەرو جێگیرکردنی چەمکی نوێ تیایاندا.*

١٢) *بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆییو پتەوکرنی.* راکێشانی دەوڵەت و هێزە بێلایەنەکان و زیاتر پتەوکردنی پەیوەندییە دۆستانەکان، لەگەڵ دەوڵەت و هێزە هاوپەیمانەکاندا.

١٣) *شاردنەوەی مەبستە راستەقینەکانی کێشەو جەنگ و ملململانێکانی ناوخۆ* و نیشاندنی لەشێوەی جەنگی ئایینیو ئایەفەگەریو ئایدۆلۆژی رووت دا. ئەمە لەکاتێکدا نەخشەدارێژەرە تەڵەکەبازەکان خۆیان لەودیو پەردەوە دەشارنەوەو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان یاری بەهەستی خەڵک دەکەن.

١٤) *گۆڕینی رەوت (الإتجاه) لە ریشەوەو رواندنێکی رەوتێکی تر لە جێگەکەی.*

١٥) *باوەڕهێنان بە دوژمن کە کێشەکەی نارەوایەو* تێکشکان بەشێوەیەک جگە لە بەزین و خۆبەدەستەوەدان هیچ ئومێدو ڕێگاچارەیەکی تری لەبەردەمدا نییە.

پشێوی لە سەربازگەی دوژمندا بۆ کارکردنە سەر (انضباط)ی تاکەکان و بڕیاری فەرماندەو سەرکردەکان لە بواری جەنگ دا.

پرۆفیسۆر (ریتشارد کروستمان) لێپرسراوی بەشی جەنگی دەروونی لەبەریتانیادا دەڵێت: (ئامانجی ئەم جەنگە تێکشکاندنی رەوشتی دوژمن و پەشۆکاندنی دیدە سیاسیەکەیەتی، هەروەها لە گۆڕانی هەموو ئەو بەهاو بیروباوەڕانەی کە باوەڕی پێیەتی. لەجێگای ئەو وانەی تازەی پێبدرێت. بۆ ئەوەی بگاتە ئەو حاڵەتەی ئێمە باوەڕمان بە چیە ئەویش باوەڕی بەوە بێت).

*بەگشتی دەتوانین ئامانجەکانی جەنگی دەروونی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:*

١) *نەهێشتنی بڕوای دوژمن بە سەرکردایەتیو چەک و جبەخانەکەی.*

٢) *دروستکردنی بارێکی شڵەژاو لای دوژمن*، تا بگاتە ئەو بڕوایەی ئامانجەکانی لەجەنگدا ناڕاستن و دوودڵ کردنی لەوەی توانای ئەوەی هەبێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

٣) *زیادکردنی ناکۆکی لەنێوان حکومەتی دوژمن و گەلەکەیدا*، ئەمەش لەڕێگای هاندان و پەرەپێدانی بزوتنەوە بەرهەڵستکارەکانی ژێر سایەی دەسەلاتی.

٤) دووبەرەکی نانەوە لەنێوان دوژمن و هاوپەیمانەکانیداو بێبەشکردنی لەهەر هاریکاریەکی سیاسیو ئابووری لەگەڵیاندا. دەکرێت بۆئەم مەبەستە سوود لەهەستی تایەفەگەریو نەژادیو نەتەوایەتیو ناوچەگەریتی وەربگیرێت یاخود گەورەکردنی لەڕادەبەدەری رووداوێک. چیرۆکی یەکێ لە هاوولاتیان بەناوی (نەعیمی کوڕی مەسعود) لە هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانیەتی نێوان قوڕەیش و هێزە شالاوهێنەرەکان لەجەنگی (احزاب)دا لەگەڵ ئابوری پێنجەمی ناو مەدینە کە جولەکەکانی (بني قريظة) پێکیان دەهێنا. نموونەی هەوڵێکی سەرکەوتووی ئەم بوارەیە.

٥) *بەهێزکردنی دۆستایەتیو هاریکاری لەگەڵ هێزە هاوپەیمانەکانداو* دروستکردنی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ لایەنە بێلایەنەکان و دۆستەکانداو بەدەستهێنانی پشتیوانی و پشتگیری دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکان.

٦) *کەرت و پەرت کردنی ریزەکانی دوژمن و نانەوەی دووبەرەکیو* ناکۆکی لەناویدا لەم رووەوە جەنگی دەروونی جەخت لەسەر هەندێ بیروڕا دەکات و سوودیان لێوەردەگرێت وەک هەوڵدان بۆ دروستکردنی ناکۆکی چینایەتیو

وروژاندنی هەستی رەگەزپەرستیو خێلایەتیو تێکدانی پەیوەندی نێوان پارتە سیاسیەکان و رێکخراوە جەماوەریەکان ...... هتد. ئەمەش دیارە بەمەبەستی لاوازکردنی بەرەی ناوخۆ هاتنەخوارەوەی توانا بەرگرییەکانی.

٧) *قەناعەت کردن بە هێزەکانی دوژمن کە ئەو ئامانجانەی لەجەنگدا هەولی بۆ دەدەین راست و رەوان و هەقی خۆمانە بۆیان بجەنگێین.* هەوڵدان بۆ ئەوەی تاکەکانی دوژمن هاوسۆزی لەگەڵ ئەم ئامانجانەدا پەیدابکەن.

٨) *هەوڵدان بۆ سڕینەوەی هوشیاریو ئاگایی لەرێی دووپات کردنەوەوە.*

٩) *شکست پێهێنانی دوژمن و بەدیهێنانی بارێکی شڵەژاوی دەروونی لەلای،* چاندنی تۆوی رەشبینیو نائومێدی لەدڵ و دەروونی هێزەکانیداو باوەڕنەهێشتنیان بە بنەماو ئامانجەکانی. هەروەها لەڕووهەڵمالینی شێوازی دوژمن و هەوڵدان بۆ لەق کردنی پایەکانی رژێمەکەی وەک پێشەکیەک بۆ رووخاندنی.

١٠) *کارکردنە سەر هەلویست و ئامانج و رەفتاری جەماوەر.*

١١) *شۆردنەوەی مێشکی بەرامبەرو جێگیرکردنی چەمکی نوێ تیایاندا.*

١٢) *بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆییو پتەوکرنی.* راکێشانی دەوڵەت و هێزە بێلایەنەکان و زیاتر پتەوکردنی پەیوەندییە دۆستانەکان، لەگەڵ دەوڵەت و هێزە هاوپەیمانەکاندا.

١٣) *شاردنەوەی مەبەستە راستەقینەکانی کێشەو جەنگ و ململانێکانی ناوخۆ* و نیشاندنی لەشێوەی جەنگی ئایینیو تایەفەگەریو ئایدۆلۆژی رووت دا. ئەمە لەکاتێکدا نەخشەداڕێژەرە تەڵەکەبازەکان خۆیان لەودیو پەردەوە دەشارنەوەو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان یاری بەهەستی خەڵک دەکەن.

١٤) *گۆڕینی رەوت (الإتجاه) لە ریشەوەو رواندنێکی رەوتێکی تر لە جێگەکەی.*

١٥) *باوەڕهێنان بە دوژمن کە کێشەکەی ناڕەوایەو تێکشکان بەشیەتی.* جگە لە بەزین و خۆبەدەستەوەدان هیچ ئومێدو رێگاچارەیەکی تری لەبەردەمدا نییە.

# هەندێ شێوازی عەمەلی جەنگی دەروونی

**( بەمەبەستی گۆڕینی رەوت و کارکردنە سەر بەرامبەر )**

*لەخوارەوە ئاماژە بە هەندێ شێوازی جـەنگی دەروونـی دەکـەین کـە دوژمن بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانی پشتیان پێدەبەستێت:*

١) *کۆکردنـەوەو ئاراستـەکردنی راسـتـەوخۆی رق و کینـە رووەو بەرامبـەر.* بەئامانجی ورە رووخاندن. بـەجۆرێک کەهـەرچی پـێی دەوترێـت سـۆزو بەزەیی نەیهێڵێت لەئارادا. یاخود تەنها یەک خۆشەویستـیو یـەک رق و کینەو رق لێبوونەوە بمێنێو هیچی تر. تا وردە وردە ئەم خۆشەویستـیو رق لێبوونەوە کۆدەبێتەوەو کەڵەکە دەبێت و رق لێبوونـەوەدەبێت بـە دەرگای دەست درێـژیو دڵڕەقـی. بـەم جۆرە دەسـت درێـژی بیـانوی بـۆ پـەیدادەکرێت و پاسـاوی بـۆ دەهێنرێتـەوە، هەسـت بـە تـاوان و سـزای ویژدانیش کە لەوەو پێـش هـەبووە لەبـەرچاو ون دەبێـت و نـامێنێ. بـەم جۆرەی باسمـان کـرد لایـەنی دەسـت درێژیکـار کاردەکاتـە سـەر نـاخ و دەروونی جەنگاوەرەکانی.

٢) *سوودوەرگرتن لە داکۆکیکردن و وروژاندنی هەندێ بیروڕا کـە دەربـارەی کەسـان و میللـەتان لەئارادایـە.* لـەڕێی پروپاگـەندەی چەواشـەکەرو گومڕاکەرەوە ئەم بـیروڕاو سـەرنجانە گـەورە دەکرێـت و دەخرێتـە پێش چاو. بۆ نموونە کەسێ بیەوێ دژی رێبازێک یاخود میللەتێک بووەستێ دەچێ چی کەم و کورتیان هەیە دەیخاتە روو. هەر بەمەشەوە ناوەستێو ئەوەندەی بۆی بکرێت هەرچی خراپیو سلبیات هەیە دەیداتە پاڵیان. خۆ ئەگەر هەندێ کەم و کوڕیو ناتەواوی هەبێت ئەوا ئەم فـوی تێدەکـات و قەبەی دەکات.

٣) *هەڵبژاردن ، واتە هەڵبژاردنی راستیەک لەنێوان کۆمەڵـە راستـیەکدا.* بـەو جـۆرەی کـە لەگـەڵ مەبەسـتەکانیدا دەگونجێـت و درۆودەلەسـەو پروپاگەندەکانی لەسەر بنیات دەنێت.

٤) *درۆکردن، ئەمـەیان لاوازتریـن هۆیـە،* چونکـەدرۆی رووت سـوودی نیـەو تەمەنی کورتە. پشت بەستن بە هەندێ شتی راست و واقعیو (منطق)ی بەرهەمەکـەی مسـۆگەرترە. لەبەرئـەوە دەبینـی پروپاگـەندەی

هاوپەیمانەکان لە جەنگی دووەمدا لە هی گۆبلزی ئەلمانی سەرکەوتووتر بوو کە ئەمەی دوایی پشتی بەم ریسایە بەست کە دەڵێ (درۆ بکە.. درۆبکە.. تنا خەڵک بەراستت دەزانن و ، بڕوات پێدەکەن) خۆ لەم چەرخەدا کە هوشیاری مرۆڤەکان زیاتر بووە درۆکردنی بەردەوام زۆر سوودی نابێو سەرکەوتوو نابێ. چونکە لەزۆربەی کاتدا جەماوەر خۆی چاودێری رووداوکانەو چاوەڕێی ئاکام و ئامانجەکانە.

٥) *دووپات کردنەوە بەشێوازو وێنەی جۆراوجۆر* کە هەموو شتەکان هەمان واتا بگەیەنن. مەبەست لە دووپاتکردنەوە ئەوە نیە وەک تووتی شت بوترێتەوە، بەڵو دەبێت دووپاتکرنەوەیەکی هونەریو ئەدەبیو زانستی شاراوەو رەنگاورەنگی وا بێت کە لە ڕواڵەت و داڕشتندا لەوەکەی پێش خۆی نەچێت و جیاواز بێت.

٦) *بەخت کردن و ئاشکراکردنی مەبەست* و نەکردنەوەی بوار بۆ گومان دروستکردن و دوودڵیو ڕاڕاییو تانەدان.

٧) *ئاماژەکردن بە (دوژمنێک)* جا ئەم دوژمنە راست بێت یان خەیاڵ گرنگ نیە. ئەمەش بۆ بەهێزکردنیورەی خەڵکیو کۆکردنەوەی هەستی دوژمنکارانەیان و ئاراستەکردنی بۆ دوژمنێکی بەدەر لەوەی هەڵدەستێ بە پروپاگەندەکە. بۆ نموونە ئەورووپیو ئەمریکیەکان دوای رووخانی پەیمانی وارشۆو بلۆکی رۆژهەلات بۆ پاساودانی مانەوەی پەیمانی ناتۆو دۆزینەوەی دوژمنێکی دەرەکی، باس لەوە دەکەن کە ئێستا رابوونی ئیسلامیی جێگای دوژمنە کۆنەکەی گرتۆتەوە. دیارە ئەمە بۆ ئەوەیە هیچ هەستێکی دوژمنکارانە روونەکاتە خاوەنی پروپاگەندەکە. خەڵکیش زیاتر ئامادەیی ئەوەیان تیا بێت کەبە ئیقاعی جەنگی دەروونی ئەم بجولێنەوە. مەیلە دوژمنکاریەکانی مرۆڤ پێویستە ئاراستەی ئامانجێکی دیاریکراو بکرێت و بەسەریدا بڕژێت، جەنگی دەروونیش بەشێوازە ژێریەژێریەکانی خۆی رێگا بۆ ئەم ئامانجە خۆش دەکات.

تۆمەتبارکردنی دوژمن و ناوبرین بەسەریدا بەناوێک کە رەمزی شەڕخوازی بێت، وەکو (فاشی، نازی، توندڕەو....هتد) دەچێتە ئەم خانەوە.

٨) *بۆ سەلماندنی ئەو مەبەستەو ئامانجەی دەمانەوێت و جەخت لەسەرکردنەوەی پێویستە پشت بە سەرچاوەی بەهێزو متمانەدار ببەسترێت.* بۆ نموونە بوترێت (... یەکێ کە بەچاوی خۆی شتەکەی بینیوە لێدوانێکی داو وتی ....هتد)، یاخود (... دیلێک راگەیاندو وتی

که ...هتد) یاخود (... کۆمەڵێ پزیشکی پسپۆڕ رایانگەیاند کە ئەوەی روویداوە بەهۆی ماددەی ژەهراویەوە بووە...) ناوهێنانی پزیشکی پسپۆڕو دیل و یەکێ بەچاوی خۆی بینیویەتی هەر لەسەرەتاوە دڵنیایی و متمانە بۆ مەبەستەکە دروست دەکات. هەرئەوەندەش مرۆڤ یەکەم جار پێی قایل بوو لە دووبارەکردنەوەو هەندێ شێوازی تر وای لێدەکەن بچەسپێ.

٩) *بڵاوکردنەوەی ئەو (شایعە)انەی کە ترس و دوودڵی و واق و ڕمان و دڵەڕاوکێ دەنێنەوە*، کە ئەمە سەرەتای بەلەرزە خستنی بەرەی ناوخۆیە.

١٠) *بەدەستهێنانی دۆستایەتی بێلایەنەکان یاخود راکێشانیان بۆ ناو هەمان ئەوژم*، لێرەدا دەردەکەویت کە ئامانجەکانی جەنگی دەروونی جۆراوجۆرە بەرامبەر لایەن و دوژمن و دۆست بەکاردەهێنرێت.

١١) بەکارهێنانی رادیۆی نهێنی ئەم جەنگە رادیۆیی یە لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا بە (جەنگی رەش) بەناوبانگ بوو. وا باوە کە ئەم رادیۆیانە دەدرێنە پاڵ کۆمەڵ و دەستەوتاقمێک کە یان هەر لەبنەڕەتەوە بوونیان نیە یاخود بوونیان هەیە بەڵام لاوازو هەرناوە.

١٢) *بەکارهێنانی چەکی سێکسی* یان حەزە سێکسیەکان و سەرچاوەو هۆیەکانی تری رابواردن دژی کەسانی تر. زایۆنیەکان دەستێکی باڵایان لەمەدا هەیەو تا ئێستا سوودی زۆری لەم چەکە وەرگرتووە دژی فەلەستینیەکان و وڵاتە عەرەبیەکانی دەوروبەر.

١٣) *هەوڵدان بۆ سەرلێتێکدان و چەواشەکردن لەپێش دەستکردن بەهەر جموجوڵێکی سیاسی و سەربازی*، ئەمەش لەڕێگای رادیۆو رۆژنامەو هەواڵی تەواو پێچەوانە یاخود هێمن کەرەوەو لانەکردنەوە بەلای نیازو مەبەستە شاراوەکاندا.

١٤) *هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی گومان و نەهێشتنی متمانەی هاووڵاتی بەرامبەر ریشەی مێژوویی و کەلەپوورو شانازییە نەتەوەییەکان*. ئەمەش لەپێناو ئەوەی دوژمن برستی لێببڕێت و توانای بەرگری نەمێنێ و تووشی سەرشۆڕی و لاوازی ببێت. زۆرجار دەست لێوەشاندنی بێ هۆو گرتن و ئەشکەنجەدان لەسەر سادەترین شت و تەقاندنەوەی ماڵی خەڵکی، بەمەبەستی چۆکپێدادان و دڵەڕاوکێ و لاوازکردنی پەیوەندی مرۆڤ بە زەوی و نیشتمانەکەیەوەو ناچارکردن بە کۆچ کردن و وڵات بەجێهێشتن، پەیڕەودەکرێت، ئەو سیاسەتەی لەدژی کورد پیادە دەکرێت

نموونەیەکی رۆشــن و زەقـی ئـەم شێوازەیە. دەبینـی هـەوڵی زۆر دراوە بسەلمێنرێ زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆ نەبووە. کورد لە بنـەڕەتدا نەتەوە نین، توانای خۆبەڕێوەبردنیان نیە، جا سیاسەتی وێرانکـاریکردنی خـاك و ئـاوارەکردن و شـالاوی راگوێـزان و جینۆسـایدو .. هتـد هــەموو ئەمانــە ئـامرازی راپـەڕاندنی ئـەو سیاسـەتە بـوون، هەوڵـەکان لــەدژی ئیسلامیش بەهەمان شێوە هەبووەو هەیە.

هەوڵێکی زۆر دراوە بۆ ئـەوەی بیخەنـە روو کـە مێـژووی ئیسـلام مێـژووی خوێـن رێـژیو زۆرداریو ناکۆکیـە هـەروەها (فقـە)ی ئیسـلامیی لــەژێر کاریگـەری یاسـای رۆمـانیدا نوسـیراوەو زانسـتەکانی تریـش زیـاتر هـی یۆنانیەکان بوون....هتد.

١٥) *دروستکردن و بلاوکردنەوەی بلاوکراوەو بەیاننامەی ساختە دژی لایـەنێ کە تیایدا باس لە ناکۆکیو گەندەڵیو خراپی ئەو لایەنە دەکات* و بەناوی دەستەیەکی ناو ئەو لایەنـەو بلاودەکرێتـەوە. بـۆ ئـەوەی وا لـە خـەڵکی بگەیەنێت ناکۆکیو دووبەرەکی لە ریزەکانی ئەو رێکخراوەدا بلاوبۆتەوەو کۆمەڵێ خەڵك رازینــین بـە گـوێی سیاسـەتی سـەرکردایەتیان بکـەن. وزۆرجـار بەیانەکـە بـەو شـێوە دەنوسـرێت کـە بەڕواڵــەت دڵسـۆزیو غەمخۆری بۆ چارەنوسی لایەنەکە پێوە دیارە.

١٦) تۆمـەتبارکردنی هـێزو تـەوژمێکی دیـاریکراو کـە سـەر بـە وڵاتێکـی بێگانەیەو لەوێوە ئاراسـتە دەکرێـت و هـەوڵ دەدرێـت ئاسایشـی وڵاتـی پێتێك بدرێت. زۆرجار بۆ ئەم مەبەستە کەسایەتیو بەیاننامەو هەواڵ و دەنـگ و باسـی درۆ ...هتـد دادەتاشـن بـۆ ئـەوەی جەماوەر بـاوەڕ بـــە قسـەکانیان بکـەن. دەشـێ پیـاوێکی خۆیـان بنێرنـە نـاو ئـەو لایەنــەو لەدواییدا وای نیشاندەن کەکاتێ خیانەتی ئـەوانی بـۆ دەرکـەوتووە وازی لێهێنـاون و چاوپێکـەوتنی لەگـەڵدا بکـەن و کاسـێتی پـێ پڕبکەنــەوە. یاخود بەپارە ئەندامێکی ئەو هـێزە دەکـڕێو هـەندێ شتی پێدەکرێت کەدەیکەن بەبەڵگەی دەستیان.

١٧) *هەڵسان لەکاتی جەنگدا بەهەندێ کاری وا کە بێزاریو رقـی جـەماوەر دەجولێنێو دانیەپاڵ دوژمن.* وەك بڕینی ئەندامی ئەوانەی کــوژراون بـۆ نموونە لووت و گوێ بڕینیان.

١٨) *گرتنی کەسایەتیەکی ناسراوی سەر بە تەوژم و لایـەنێو بێهۆشکردنی لەرێی شێوازی موخابەراتیەوە بەمەیو تلیـاك بـێ یـان هەرشـێوازێکی*

*هاوچەرخی تر، بۆ ئەوەی هەندێ رەفتار بنوێنێ کە لەگەڵ شوێن و پلەو پایەیدا ناگونجێت* جا بە کامێرای فۆتۆگراف و تەلەفزیۆنی وێنەی دەگرن و دوایی هەرەشەی لێدەکەن کە ئەگەر هاوکاریان نەکات یان واز نەهێنێ ئەو وێنانە دەخەنەبەرچاوی جەماوەر.

١٩) *سوودوەرگرتن لە ئافرەت بەجۆرەها شێوە.* بۆ نموونە ئافرەتی سۆزانی بەجل و بەرگێکی ئیسلامیەوە دەنێرنە لای هەندێ ئیسلامخواز بۆوەی بتوانن لەخشتەی بەرن و دوایی وێنەی بگرن و یاخود ئافرەتێکی لەو جۆرە بنێردرێتە ناو رێکخراوێکی ئیسلامیی ئافرەتان و رواڵەتی ساختەی ئیسلامیی پێبدەن و دوایی بەدرەفتاریەکی پێ ئەنجام بدرێت و ئەمە بکرێتە کەرەسەی پروپاگەندەو ناشیرین کردنی رێکخراوەکەو نەهێشتنی متمانەی جەماوەر پێیان.

٢٠) *شت خستنە ناو ماڵ و بارەگای لایەنێکی دیاریکراو.* بۆ نموونە لایەنێ کە زیاتر بانگەشە بۆ پاکداوێنیو دەست گرتن بە رەوشتە بەرزەکانەوە دەکەن، لێدەدرێن، دوای ئەوە دەچن هەندێ حەپی مناڵ نەبوون و وێنەی شەرماوەر دەخەنە بارەگاکەیان و خەڵکی دەبەنە سەیریو بڵاویدەکەنەوە، ئەوانەی کەخۆیان لەم خەڵکە کردبوو بە فریشتە ئەمانەبوون کە دەیبینن؟!

## ئامرازەکانی جەنگی دەروونی لە کۆندا

*ئەوانەی پێشبەوە زیاتر ئامرازی هاوچەرخی جەنگی دەروونین، هەر لە کۆنیشەوە چەندەها شێوازو ئامرازی تری هەبووە کە لە خوارەوە بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین:*

١) دڵەراوکێو نائارامیو پەشێوی نانەوە، بەبەکارهێنانی چەندان هۆی وروژێنەری وەکو جنێوپێدان.

٢) درۆبەدەمەوە هەڵبەستن و شێواندنی ئەو کێشەی کە دوژمن لە پێناویدا دەجەنگێ وە تاوانبارکردنی بزاڤی ئیسلامیی لەکاتی جەنگی ساردا کە داردەستی ئەمریکان، یاخود دانانی شۆڕشی کورد بە پیلانی دوژمنانی بێگانەو دەزگا مەخابەراتیە جیهانیو ناوچەییەکان.

٣) باوەڕ لاوازكردن بەسەركەوتن و بلاوكردنەوەی گیانی بەزین و هەرەسهێنان.
٤) دامەزراندن و دروستكردنی هێزێكی گەورەو ترسناك و بەسووك سەیركردنی هێزی دوژمن و لەشان و شكۆ داشكاندنی.
٥) هەرەشەكردن بەهۆی خۆپرچەك كردنەوە.
٦) تۆقاندن و بلاوكردنەوەی ترس و لەرزو ترسان بەهەژارییو مردن و شایعە بلاوكردنەوە.
٧) لەخۆباییكردن و سەرلێشێواندن و بەلێن پێدان و هەڕەشە لێكردن، هەروەها هەولدان بۆ راكێشانی كەسانی بێلایەن و ڕاڕاو دوودڵ.
٨) سوودوەرگرتن و قۆزتنەوەی ناكۆكییە ئاینیو ئایدۆلۆژییەكان و بزواندنی هەستی تایەفەگەریو رەگەزپەرستیو تاودانی رق و كینە.
٩) سوودوەرگرتن لە پەیوەندییەكانی ژن و مێردایەتی. بۆ نموونە هەولدان بەو سەربازانەی كە لەبەرەكانی جەنگ دەجەنگن كە هاوسەرەكانیان خەریكی داوێن پیسین و تووشی چەندەها نەخۆشی شاراوەبوون. ئەمە وا لەو سەربازانە دەكات باری خێزان و كەسوكاریان تووشی نائومێدیو دلەڕاوكێیان بكات و تووشی ورە بەردان و هەلاتن بێن.

## خۆپاراستن لەجەنگی دەروونی

بۆ بەرەورووبوونەوەی جەنگی دەروونیو پوچەلكردنەوەی نەخشەكانی دەكرێت هەر شوێن پێی ئەو بنەڕەتە زانستیانە هەلبگیرێت. كە ئەو نەخشانەی لەسەر بنیات نراوە. ئەمە سەركەوتووترین رێگایە. ئەمەش لێكولینەوەیەكی وردو بەردەوامی دەوێت لەتەواوی ئەو بارودۆخ و قۆناغانەی ولات پیایدا تێپەڕیوەو تێدەپەڕێت.

هەروەها دەربارەی دانیشتوان و دەولەتە دۆست و دراوسێكانیش. سەرەڕای سیاسەتی پەیوەندی بە ولات و نیشتمانەوە هەیە. بۆ ئەوەی هەموو بارودۆخێك بە گوێرەی خۆی نەخشەی بۆ دابڕێژرێت. *لەخوارەوە ئاماژە بۆ گرنگترین ئەو رێو شوێنانە دەكەین كە بۆ خۆپاراستن لە جەنگی دەروونی پێویست دەكات پەیڕەویان لێبكرێت و لە پێش چاو بگیرێن.*

١) لەبەرئەوەی جەنگی دەروونی ئامانج تیایدا ورە وباری دەروونیە، لەبەرئەوە *بیروباوەڕو ئیمانێكی قوولی ئیسلامیی باشترین سەنگەری*

خۆپارستنە لەداوی ئەم جەنگە. باوەڕداری ڕاستەقینە لە هەڕەشەکانی دوژمن ناترسێت. بەڵکو زیاتر گیانی قوربانیدان و تێکۆشانی لا بەهێزتر دەکات.

( الذين قال لهم الناس إن الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم فزادهم إيمانـا وقـالوا حسبنا الله ونعم الوكيل) ال عمران/٧٣.

زانا دەروون ناسەکان لەسەر ئەوە هاودەنگن کە جەنگی دەروونی زیاتر کار لەو سەربازانە دەکات کە خاوەنی باوەڕێکی پتەوو بەهێزنین و هوشیاری سیاسیان تەسکەو لەئاستێکی ڕەۆشنبیری نزمدان.

٢) لەبەرئەوەی تاک ئەو هێزە دەروونیو فکریەی کەهەیەتی لە کۆمەڵەکەیەوە وەریدەگرێت، لەبەرئەوە پاراستنی گیانی کۆمەڵ و هاریکاریو پشتی یەکگرتن و خۆنەویستی، گیانی برایەتیو لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی گشتی پەروەردە بکرێت.

لەناو کۆمەڵگایەکی موسڵمانی وەکو کوردەواریشدا ئیسلام باشترین هەوێنی دروستکردنی ئەو گیانەو پەروەردەکردنی تاکەکانە بەو بەها بەرزانە. ئیسلام زۆر بەجوانی دەتوانێ ئەو یەکیەتیە فکرییو دەروونی وکۆمەڵایەتیە بەدیبێنێت و تۆوی خۆشەویستیو برایەتی لەناو تاکەکانی کۆمەڵگادا بچێنێت و بیانکات بە جەستەیەکی پتەو.

٣) هێمنیو لەسەرخۆییو خوێن ساردیو وردبوونەوەو تاووتوێکردنی هەموو هەواڵ و چیرۆک و بەیت و بالۆرو چاوڕاوێک. چونکە *باشترین چەک دژی چاوڕاو گوێپێنەدان و بلاونەکردنەوەیەتی*. هەڵچوون و هەڵپەکردن و بڕیاری سەرپێیو لێنەکۆڵینەوە لەینەڕەتی ڕووداوەکان و تەتەڵەنەکردنیان، مرۆڤ بەهەڵەدا دەبات و وای لێدەکات هەڵوێستی نادروست بگرێت.

٤) بڕوابوون بە سەرکردایەتیو تێگەیشتنی سیاسەتەکەی دەربارەی کێشە ناوخۆییو دەرەکیەکان. پێویستە مرۆڤ بەتایبەتی مرۆڤی باوڕەدارو دڵسۆزی ڕاستەقینەی گەل بەوپژدان بێت، دەسیسەو پیلان و نەخشەی ناحەزان دەرک پێبکات، وانەبێت هەر لەبەر حەزنەکردن لەرەخنەگرتن رەخنە بگرێت. دەبێت رەخنەگرتن بەرپرسانەو لەشوێنی خۆیدا بێت. بەو جۆرە نەبێت خزمەت بەدوژمن بکات و ئامانجەکانی بێنێتەدی.

٥) دەرخستنی *ڕاستیەکان بۆ خەڵکی* چونکە نەبوونی زانیاریو ئاگایی پێویستی بۆشاییەکی فکری دروست دەکات و ئەندامانی کۆمەڵگا

دەکات بە نێچیرێکی ئاسانی پڕوپاگەندەی ژەهراویو درۆو دەلەسەی دوژمن.
دەسەلاتدارە دکتاتۆرەکان لە ئاشکرابوونی راستیەکان زۆر دەترسن، چونکە پەردە لەڕووی ریسواییەکان و کێشە مەترسیدارە کەلەکەبووەکانی ناو کۆمەڵ هەلدەمالیو بەمەش بەرژەوەندیان دەکەوێتە مەترسییەوە.
٦) *دوورکەوتنەوە لەهەست کردن بەلاوازیو پەژارەو نائومێدی:*
باوەڕی تەواو بەوەی سەرەنجام سەرکەوتن بۆ خاوەن هەق و کێشە رەواکانە. دیارە لە سەغلەتیو تەنگانەدا حەقیقەتی باوەڕەی باوەڕداران دەردەکەوێت، تێکۆشەری باوەڕدار پێی وایە ئازارو ناڕەحەتییەکانی رێگای خەبات و تێکۆشانیهەق خوازانە مایەی لێخۆشبوونی نزیک بوونەوەیە لەخوای گەورە. گەر لەم پێناوەشدا سەری نایەوە ئەوە شەهیدیەو سەرەتای نەمرییە نەک کۆتایی ژیان. قورئان بەم گیانە شوێنکەوتوانی پەروەردە دەکات.
٧) *دەولەت پێویستە بەردەوام چاودێری جەماوەری گەل بکات. لەگەلیاندا کراوەبێت کەنالی پەیوەندیکردن لەگەلیاندا والاو کراوەبێت.* لە بۆنە دیاریکراوەکاندا سیاسەتی خۆیان بۆ روون بکاتەوە. چونکە گۆشەگیریو بێدەنگی لەئاست رووداوو چاوەڕوانیەکانی گەلدا. بە کەمتەرخەمیو فەرامۆشکردن لێک دەدرێتەوە. زۆرشت وردکردنەوەو درێژ دادڕیش دیسان لەجێگای خۆیدا نیەو دەبێت بەمایەی بێزاریو بەنیشانەی ناتەواویو کەم و کورتی راڤەدەکرێت.
٨) *تۆکمەییو پتەوی بەرەی ناوخۆ.* چونکە لەکاتی جەنگدا باشترین پشتیوانی جەنگاوەرانە. خوێن گەرمیو باوڕەی جەنگاوەر لەپشتگیریو خوێن گەرمی خێزان و کۆلەکەی لەناو نیشتماندا، سەرچاوە دەگرێت. پێویستە مەدەنیەکان سەربازەکان تێبگەیەنن کە لەخۆشیو ناخۆشیدا لەگەلیاندان، وە بەختەوەری راستەقینە وا لە راپەڕاندنی ئەرکی سەرشاندا. نەمریش وا لە خزمەتکردن بە بیروباوەڕو گەل و نیشتماندا.
٩) *وریابوون لەبەرامبەر شالاوی داگیرکاری رۆشنبیریدا (الغزو الثقافي) کە لەبەرگی ئەدەبیاتی بێلایەن؛ یاخود هەندێ گۆڤارو بلاوکراوەی گومان لێکراودا، خۆی گۆڕیوە.* دەبێت رووناکبیرانی نیشتمانپەروەرو دەزگا بەرپرسەکان ئەم نەخشەیە بکەن بە کەفی سەرئاو. رێگا نەدەن بەهۆی

لەرھەنگی ھەرزان بەھاو بازاڕی نامۆو ناسنامەو کەسایەتی نیشتمانی بلاوبوەتەوە.

١٠) *بایەخ دان بە کەلەپوورو کەلتوورو رەسەنایەتی‌و مێژووی نەتەوایەتیدا،* لەژێر پەردەی گەوھەرە بەنرخەکانیدا، بەبێ‌ئەوەی ئەمە وامان لێبکات پەیوەندیمان بەجیهانەوە بپچڕێت و مامەڵەو پەیڤین لەگەڵ رۆشنبیرییە ھاوچەرخەکاندا نەکەین. ھەرکەسێ کەلەپووری نەبێت، مێژووی نییە. کەمێژووش نەبوو بنەڕەتی نابێت. سەرەنجام توانای خەبات و بەرەنگاری نابێت. ھۆکارێکی ورەبەرزی‌و دەروون نەبەزین، ھەستکردنە بە سەرفرازی‌و مێژووی پرشنگدارو زێڕین.

١١) *زیادکردنی هاریکاری‌و ئاڵ و گۆڕی پەیوەندی لەگەڵ گەل و دەوڵەتە دراوسێکاندا.* ئەمەش لەرێی وەرزش و وەفدی لاوان و راگەیاندن و دەزگا رۆشنبیرییەکانەوە کەدەبێتە فراوانبوونی بەرەی بێ‌لایەنی‌و گۆشەگیری سیاسی ناھێڵێت.

١٢) قەڵاچۆکردنی چالاکیەکانی تابوری پێنجەم، ئەوەش بەم خالانەی لای خوارەوە:

١- بوونی بەرنامەیەکی ھوشیارکردنەوەی ھەمەلایەنە. بەمەبەستی گەشەپێدانی ھەستی بەرپرسیاریەتی لای ھاووڵاتیان و دەرخستنی نیازەکانی دوژمن و، جەخت کردنە سەر ئەو دەورە وێرانکاری‌و پڕ مەترسیەی کەتابوری پێنجەم پێی ھەڵدەستێ. لەگەڵ روونکردنەوەی شێوازو جۆرەکانی کارو چالاکیەکانیدا.

٢- بەدیھێنانی یەکیەتی نیشتمانی، بۆ ئەوەی بەکرێگیراوەکانی تابوری پێنجەم دزەی لێوە نەکەن، چونکە گەلێکی بێ‌شیرزەو لێکھەڵوەشاو باشترین شوێنی ئەوانە.

٣- سنوردانان بۆ چالاکی بێگانەکان و چاودێری‌کردنیان.

٤- ھەوڵدان بۆ دەستگیرکردنی سیخوڕو چلکاوخۆرانی دوژمن و پاکردنەوەی وڵات لێیان.

١٣) *گرتنەبەری رێ‌و شوێنی وردو بەھێز بۆ قەڵاچۆکردنی ئیستیخباراتی دوژمن و خۆپاراستن لەکاری جاسوسی‌و تێکدەرانە.* پێویستە ئەم چالاکیانە لەگەڵ جەنگی دەروونیدا رێک بخرێت.

١٤) *چاودێری‌کردنی دەزگاکانی راگەیاندن بۆ ئەوەی ئەو بابەتانە بلاونەکانەوە کە دوژمن بۆ سازدانی جەنگی دەروونی سوودیان*

*لێوەردەگرێت.* هەڵبەتە نابێ ئەمە بکرێت بە بیانوو بۆئەوەی ئازادی ڕاگەیاندن نەمێنێو ئەو دەزگایانە نەتوانن لەدیاردە دزێوەکان بدوێن.

١٥) *دانانی سیاسەتێکی یەکگرتووی ڕاگەیاندن بەمەبەستی دەرخستنی حەقیقەتی دوژمن لەبەرامبەر ڕای گشتی ناوخۆو جیهاندا.*

١٦) *هەڵوێست دیاریکردن لەبەرامبەر ڕووداوەکاندا هەروەها ئاگایی‌و شارەزایی پەیداکردن بەسەر بنچینەکانی جەنگی دەروونی دوژمندا.*

١٧) *هەڵسانی دەوڵەت بە لێکۆڵینەوە لەداخوازی‌و پێداویستیەکانی گەل و دەستەبەرکردن و تێرکردنیان.* چونکە گەلێکی هەژارو بێبەش کێلگەیەکی بەپیتی جەنگی دەروونی دوژمنە. پێویستە خێرو بێری وڵات بۆ خۆشگوزەرانی دانیشتوانەکەی بەکاربێت. چونکە نایەکسانی‌و هەژاری‌و بێ‌دەرەتانی جەماوەرو ناعەدالەتی لە دابەشکردنی ساماندا ڕێگا بۆ هەوڵە تێکدەرەکانی دوژمن دەکاتەوە.

١٨) *جەنگانە دژی گەندەڵی سیاسی‌و ئابووری‌و کارگێڕی لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت و ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکاندا* هەروەها دوورکەوتنەوەی کاربەدەستان لە یاریکردن بە سامانی وڵات و بەفیڕۆدانی لە ڕابواردنی شەخسیدا.

١٩) *پیرەوکردنی دیموکراسیەت لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتی سیاسیداو دابین کردنی ئازادی سیاسی‌و مەدەنیەکان.* تاکو گەل ڕژێمەکەی بەموڵکی خۆی بزانێو دوژمن نەتوانێ ناکۆکی نێوان گەل و ڕژێم کە لە وڵاتە دکتاتۆرەکاندا لەئارادایە، بەقازانجی خۆی بقۆزێتەوە.



## سەرچاوەکان :


١- صلاح نصر ، الحرب
الثانية، القاهرة، ١٩٦٧.
٢- موسى زناد / الحرب النفسية ، مكتبة الد
بغداد / ١٩٨٤ز
٣- العامري/ عصام فاهد جواد، الدعاية الايرانيـة و.
دارالحرية للطباعة، ١٩٨٧.
٤- مصطفى سعيد، فن الدعاية ، جامعة بغداد، ١٩٦٧.
٥- ئازاد قزار، الدعاية والاشاعة والحرب النفسـية، ملزمـة غير منشـورة، ١٩٩٣.
٦- النظرية الاسلامية في الحرب النفسية، القاهرة، دار الأعلام ، ١٩٧٩.
٧-الدكتور عبداللطيف حسنين فرج والدكتور عزالدين جميل عطية، علـم النفس العكسكري، دار الشروق، ١٩٨٧م.
٨- الدكتور احمد نوفل، دراسات إسلامية هادفـة، الاشـاعة، دار الفرقـان للنشر والتوزيع، عمان، ١٩٨٣.
٩- خـەبات/ جـەنگی سـایکۆلۆجی بـەعس و جـەنگی سـایکۆلۆجی کـوردو مـەسەلەی ئیعلام، لە بلاوکراوەکانی دەزگای دیموکراسی، ١٩٩٢.
١٠- الحـرب النفسـية ، سلسـلة الثقافـة الثوريـــة ٢٩، المؤسســة العربيــة للدراسات والنشر، بيروت، بدون سنة.
١١- مجلة التوحيد العدد ٧٨ تشرين الأول ١٩٩٥.
١٢- مجلة التوحيد العدد ٦٧ تشرين الأول ١٩٩٣.
١٣- کۆمەڵـە، گۆڤـاری کۆمـەڵـەی رەنجدەرانـی کوردسـتان، ژمـارە (١٦) خولی (٣) نیسانی ١٩٨٧.
١٤- د. كـامل الدبـاغ ، الحـرب النفسـية، سلسـلة الموسـوعة الصغـيرة، ١٩٧٩/٣٨/بغداد.
١٥- مجلة الدعوة/ العدد ٥٩، السنة الرابعة، مارت ١٩٩٧.
١٦- د. ماجد ربيع / الحرب النفسية في الوطن العربي، بغداد ١٩٨٩.
١٧-دراسات إسلامية لأحد علماء الأزهر.
١٨- حرب الاشاعات وكيفية دحرها.

١٩٩٧/١٠/١٢

# الحرب النفسية

بقلم

أبوبكر علي

١٤١٨ هـ ١٩٩٧م

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشبیر
سلێمانی . بازاڕی ڕاپەڕین

لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە چاپ کراوە